# شَرْحُ السُّنَّةِ

تَـأليفْ

إمَـام أَهْل السُنَّة والجَماعَة في عَصْرِه

أبو محَمَّد الحَسَنْ بنْ عَلي بن خَلف البَربَهاريْ

المتَوفى سَنَة ٣٢٩ هـ

# شەرحی سوننەی

## ئیمـام بەربەهـاری

رَحِمَهُ اللهُ

٢٨/رمضان/١٤٤٢

# شَرْحُ السُّنَّةِ

تَأليفْ

إمَام أَهْل السُّنَّة والجَماعَة في عَصْرِه

أبو محَمَّد الحَسَنْ بنْ عَلي بن خَلف البَربَهاريْ

المتَوفى سَنَة ٣٢٩ هـ

# شەرحی سوننەی

## ئیمام بەربەهاری

رحمه الله

٢٨/رمضان/١٤٤٢

بسم الله الرحمن الرحيم

کورتەیەك لە ژیانی ئیمامی بەربەهاری رحمه الله

ناوی ئەم پێشەوایە «**أبو محمد الحسن بن علي بن خلف البربهاري**» یە، لە ساڵی «**252**» کۆچی لەدایك بووە، وادەردەکەوێت لەشاری بەغدا لەدایك بووبێ و هەر لەوێش ژیاوە.

مامۆستاکانی :

لای کۆمەڵێك لە هاوەڵانی ئیمامی احمد رحمه الله دەرسی خوێندووە :

1. احمد بن محمد بن الحجاج بن عبدالعزيز ابو بكر المروذي .

2.سهل بن عبداللّٰه بن يونس بن عيسى ابو محمد التستري .

قوتابیەکانی :

1. الحسين بن عبداللّٰه أبو علي النجاد .

2. عبدالعزيز بن جعفر بن أحمد بن يزداد أبو بكر ناسراوە بە «**غلام الخلال**» .

3. عبيداللّٰه بن محمد بن بطة أبو عبداللّٰه العبكري ناسراوە بە «**ابن بطة**» کە یەکێکە لە زانا بەناوبانگەکان لەساڵی «٣٨٧ك» کۆچی دوایی کردووە .

4. محمد بن احمد بن اسماعيل ابو الحسن ناسراوە بە «**ابن سمعون**» زانا و ئامۆژگاریکار لەساڵی «**٣٨٧ك**» کۆچی دوایی کردووە .

5. محمد بن محمد بن عثمان ابو بكر المغربي .

ئەم ئیمامە بەڕێزە تووشی زۆر نارەحەتی و مەینەتی بووە لەلایەن سوڵتان و قسەی بیدعەچیەکانەوە بۆیە ناچار دەبوو کە خۆی بشارێتەوە لە دەستیان بەڵام لەهەمان کاتیشدا ئیمام هەرگیز کۆڵی نەدەدا و بەرامبەریان دەوەستاوە ئەوانیش بەردەوام لە دژی ئیمام پیلانیان دەگێڕا، بۆیە ئەم ئیمامە بەڕێزە کاتێکیش کە کۆچی دوایی کرد هەر بەشاراوەیی کۆچی دوایی کرد اللّٰه تعالی لێی خۆش بێت و بەبەهەشتی شادبکات .

ئەمە تەنیا کورتەیەکە لەژیانی ئەم ئیمامە ئەگینا چەندێك باسی کێشە و میحنەتەکانی بکەین ئەوا تەواو نابێت .

قال الإمام رحمه الله

الحمدُ للّهِ الذي هَدَانا للإسلامِ، ومَنَّ علينا بِه، وأَخْرَجَنَا في خَيْرِ أُمَةٍ، فَنَسْأَلُهُ التوفيقَ لما يُحِبُّ وَيَرضَى، والحِفْظَ مما يَكرَهُ ويَسْخَط .

ئیمامی بەربەهاری رحمه الله دەفەرموێت :

سوپاس و ستایش بۆ اللّٰه کە ڕێنمووییی کردووین بۆ ئیسلام، وە بەو ئیسلامە منەتی خۆی ڕژاندووە بەسەرمان، لەباشترین ئومەت دەریچواندووین، بۆیە داوای لێ دەکەین کە تەوفیقمان بدات بۆ ئەوەی کە پێی خۆشە «**خۆشی دەوێت**» و پێی ڕازییە، بمانپارێزێ لەوەی پێی ناخۆشە «**خۆشی ناوێت**» و پێی توڕە دەبێ .

١ - اعلَمُوا أنَّ الإسلامَ هو السُّنَّةُ، والسُّنَّةَ هي الإسلامُ، ولا يَقُومُ أَحَدُهُما إلَّا بالآخرِ .

بزانن ئیسلام بریتییە لە سوننەت، وە سوننەتیش بریتییە لە ئیسلام، هیچ یەکێکیان بێ ئەویتر ڕاست نابێتەوە .

٢ - فمِنْ السنة لُزُومُ الجَمَاعَةِ، فَمَنْ رَغِبَ غَيْرَ الجماعَة وفَارَقَهَا فقد خَلَعَ رِبْقَةَ الإسلامِ مِنْ عُنُقِهِ، وكانَ ضَالًّا مُضِلًّا .

لە سوننەتدایە پابەند بوون جەماعەتەوە، جا هەرکەسێ حەزی لە غەیری جەماعەت بێت و پشتی لێ هەڵبکات، ئەوا گرێی ئیسلامی لە ملی خۆی داماڵیوە و دەبێتە کەسێکی گومڕا و گومڕاکەر «**واتە بێجگە لەوەی خۆی گومڕایە خەڵکیش**

**گومڕا دەکات چونکە شوێنی غەیری جەماعەت کەوتوە و لێیان جیابۆتەوە» .**

٣ - والأسَاسُ الذي تُبنى عليه الجماعة وهم : أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ ﷺ ، ورَحِمَهُمْ أَجْمَعِين، وهُمْ أَهلُ السُّنَةِ والجَمَاعَةِ، فمن لم يَأخُذْ عنهم فقد ضَلَّ وابتدعَ، وكلُّ بدعةٍ ضَلاَلَةٌ، والضَّلالَةُ وأَهْلُهَا في النَّارِ .

ئەو بنەمایەی کە جەماعەتی لەسەر بنیات نراوە بریتییە لە : هاوەڵانی محمد ﷺ **«ئەوانەش دەگرێتەوە کە دوای هاوەڵان هاتوون لە تابعین و تابعی تابعین و تابعی تابعی تابعین سێ سەدە چاکەکە»**، ڕەحمەتی اللّٰه یان لێبێت، ئەوان ئەهلی سوننەت و جەماعەتن، جا هەرکەسێك

لەوانەوە وەرنەگرێت، ئەوا گومڕابووە و بیدعەی کردووە، هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە، گومڕایی و ئەهلەکەشی لە ئاگردان .

٤ - وقَالَ عُمرُ بنُ الخَطَّابِ رحمه الله : ((لَا عُذْرَ لأحدٍ في ضَلَالَةٍ رَكِبَها حَسِبَهَا هُدَىً، ولا في هُدَىً تَرَكَهُ حَسِبَهُ ضَلَالَةً، فقد بُيِّنَت الأُمُورُ، وثبتت الحُجَّةُ، وانْقَطَعَ العُذْرُ)) .
وذلكَ أنَّ السُّنَّةَ والجماعَةَ قد أَحْكَمَا أَمرَ الدِّينِ كُلِّهِ، وتَبيَّنَ للنَّاسِ، فعلى النَّاسِ الإتبَاعُ .

عمر بن الخطاب رضي الله عنه فەرموویەتی : عوزر «**بیانوو**» بۆ هیچ کەسێك نییە لەئەنجامدانی گومڕاییەك کەخۆی بەهیدایەتی بزانێت، وە بۆ کەسێکیش نییە کە واز لە هیدایەت بێنێت و

بەگومڕایی بزانێت، چونکە هەموو شتەکان ڕوون کراوەتەوە، وە بەڵگەش چەسپاوە، عوزر نەماوە و پچڕاوە .
ئەهلی سوننە و جەماعەت هەموو کاروباری دینەکەیان ڕوون کردووەتەوە و بۆ خەڵکی ڕوون بۆتەوە، لەسەر خەڵکیە کە شوێنی بکەون .

٥ - واعْلَم رَحِمَكَ اللّٰه ، أنَّ الدِّينَ إنَّما جَاءَ مِنْ قِبَلِ اللّٰه تبارك وتعالى، لم يُوضَعْ على عقولِ الرِّجَالِ وآرائِهم، وعِلمُهُ عند اللّٰه وعندَ رسولِه فَلا تتبع شيئاً بهواك فتمرق من الدين فتخرج من الإسلام فإنه لا حُجَّةَ لكَ فَقَدْ بيَّنَ رسولُ اللّٰه ﷺ لأمَتِهِ السُّنَّةَ، وأَوْضَحَهَا لأصْحَابِهِ، وهُمْ الجَمَاعَةُ، وهُمْ السَّوَادُ الأعْظَمُ : الحَقُّ وأَهْلُهُ، فَمَنْ خَالَفَ أَصْحَابَ رسولِ اللّٰه ﷺ في شيء مِنْ أَمْرِ الدِّينِ فَقَدْ كَفَرَ .

ڕەحمەتی اللّٰه ـت لێ بێت ئەم دینە لەلایەن اللّٰه تعالی ەوە هاتووە، لەسەر عەقڵ وبۆچوونی مرۆڤەکان دانەنراوە و زانستەکەی لای اللّٰه و پێغەمبەرەکەیەتی، بۆیە شوێنی هیچ شتێك مەکەوە بەحەزو ئارەزووی خۆت لەئاین یاخی ببیت ولە ئیسلام دەرچیت، چونکە هیچ حوججەیەکت نییە، پێغەمبەری اللّٰه سوننەتی بۆ ئومەتەکەی ڕوونکردوەتەوە و بۆ هاوڵانی ڕوونکردوەتەوە ئەوانیش جەماعەتن، هەرکەسێك پێچەوانەی هاوەڵانی رسول اللّٰه بکات لەشتێك لەدیندا ئەوە کوفری کردووە .

«**السواد** : بریتین لە ئەهلی حەق، ئەهلی حەق ئەوانەن دەستیان پێوە گرتووە، وە مەبەست لە «**السواد الاعظم**» ئەوانەی لەسەر حەقن هەرچەندە کەمیش بن» .

٦ - واعلم أنَّ النَّاسَ لم يبتدعوا بدعةً قط حتى تركوا مِنْ السُّنَّةِ مِثْلَهَا، فاحذر المحدثات من الأمورِ، فإنَّ كُلَّ مُحدَثَةٍ بدعة، وكل بدعة ضلالة، والضلالَةُ وأَهْلُهَا في النَّارِ .

بزانە خەڵکی هەرگیز هیچ بیدعەیەکیان دانەهێناوە تاوەکو سوننەتێکیان بەهاوشێوەی ئەوە واز لێهێناوە «**واتە کاتێ بیدعەیەکیان کردووە ئەوا بەئەندازەی ئەوە سوننەت ون دەکەن چونکە هەرگیز بیدعە و سونەت کۆنابنەوە هەریەکیان ئەویتر دەردەکات بۆیە نابێت مسوڵمان لەهەمان کاتدا سوننی و بیدعەچی بێت بەڵکو یان دەبێ بیدعەچی بێ یان دەبێ سوننی بێ ئەمەش لە زیانەکانی بیدعەیە**» بۆیە ئاگاداری داهێراوەکان بە لەدینەکەتدا، چونکە هەموو داهێنراوێك بیدعەیە هەموو

بیدعەیەکیش گومڕاییە هەموو گومڕاییەك و أهلەکەشی لەئاگردان .

٧ - واحذر صِغَارَ المحدثاتِ من الأمورِ، فإنَّ صغيرَ البدعِ يَعودُ حتى يَصيرَ كبيراً، وكذلك كل بدعة أُحْدِثت في هذه الأمَةِ، كان أولها صغيراً يُشْبِهُ الحقَ فاغتر بذلك من دخل فيها، ثم لم يَسْتَطِعْ الخروجَ منها، فعظمت وصارت ديناً يُدَانُ بِهَا، فَخالَفَ الصراط المستقيم فخرجَ مِنْ الإسلامِ .

ئاگاداری شتە تازە داهێنراوە بچووکەکان بە لەدیندا چونکە بیدعە بچووکەکان ڕادێیت لەسەری تاوەکو گەورە ئەبێت هەروەها هەموو بیدعەیەك لەم ئوممەتەدا کە داهێنراوە لەسەرەتاوە بچوك بووە و لەحەق چووە، ئەوەی تووشی بێت پێی هەڵدەخەڵەتێت ئینجا ناتوانێت لێی دەربازبێت وپاشان

«**بیدعەکە**» گەورەبوە و بۆتە دینێك و خەڵکی دینداری پێوە دەکەن، پێچەوانەبوو لەڕێگا ڕاستەکە ئینجا لەئیسلام دەرچوو .

«واتە گەر واز لە بیدعە بهێنیت ئەوا دەبێتە دین و خەڵکی دینداری پێوە دەکەن ئەگەرچی بیدعەکە بچووکیش بێت چونکە هەر بیدعەی بچووك بووە بەرەو بیدعەی گەورە چووە، لەهەمان کاتدا ئەو بیدعەیە وای لێدەکات لە ئیسلام دەرچێت بەهۆی ئەوەی لەدینەکەیدا هیچ شتێك لە سوننەتەکان نەماوە» .

٨ - فانظر رحمك اللّٰه كل مَنْ سمِعْتَ كَلاَمَهُ مِنْ أَهْلِ زَمَانِكَ خاصة فلا تعجلن، ولا تدخلن في شيء منه حتى تسأل وتنظر : هل تكلم به أصحاب رسول اللّٰه ﷺ ، أو أحد من العلماء؟ فإن

وجدت فيه أثراً عنهم فتمسك به، ولا تجاوزه لشيء، ولا تختار عليه شيئاً فتسقط في النار .

تەماشەکە ڕەحمەتی اللّٰه تعالی ـت لێ بێت ئەگەر گوێت لەقسەی هەر کەسێك بوو بەتایبەتی لەو سەردەمەی تۆی تێدای ئەوا هەرگیز پەلەمەکە و مەچۆ ناو هیچ مەسەلەیەکەوە تاکو تەماشا نەکەیت و پرسیار نەکەیت ئایە هیچ کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی قسەیان کردوە ؟

یان یەکێك لەزانایان ؟ جا ئەگەر لەوانەوە

شوێنەوارێکت دەست کەوت ئەوا دەستی پێوە بگرە و لەبەر هیچ شتێك وازی لێ مەهێنە هیچ شتێك هەڵمەبژێرە بەسەریداو بەهۆیەوە بکەویتە ناو ئاگرەوە .

«واتە تاوەکو نەگەڕێینەوە بۆ وتەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ یاخود یەکێك لە زانایان کە شوێنکەوتەی بەرنامەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بێت «**مەبەست لە سەلەفە**» نابێت بڕیار لەسەر مەسەلەیەك بدەین چونکە ئەوان ئەم دینەیان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وەرگرتووە و هاوەڵانیش لەپێغەمبەری الله ﷺ ڕیوایەتیان کردووە» .

٩ - واعلم أنَّ الخروجَ مِنْ الطريق وهو لا يرد إلَّا الخير، فلا يُقتدى بزلته فإنه هالكٌ .

وآخر عاند الحق وخالف من كان قبله من المتقين فهو ضَالٌّ مُضلٌّ، شيطانٌ مَرِيْدٌ في هذه الأمَةِ، حقيقٌ على مَنْ يَعْرِفهُ أَنْ

يُحذِّرَ النَّاسَ منه ويُبَيّن للناس قصته، لئلا يقع أحد في بدعته فيهلك .

بزانە دەرچوون لەڕێگای ڕاست دوو هۆکاری هەیە: یەکێکیان پیاوێك لەڕێگاکە هەڵخلیسکاوە لەکاتێکدا ئەو تەنها خێر وچاکەی دەوێت بۆیە ناکرێتە پێشەنگ لەخلیسکانەکەی چونکە ئەوە بەهەلاکەتدا چوە وە پیاوێك بەرهەڵستی لەگەڵ حەقدا دەکات و لەگەڵ له اللّٰه ترساوانی پێش خۆی ناکۆکە ئەوە گومڕایەکی گومڕاکەرە شەیتانێکی سەرکەشی یاخییە لەم ئومەتەدا پێویستە لەسەر هەر کەسێك ناسییەوە خەڵکی لێ ئاگاداربکاتەوە وخەڵکی لە چیرۆکەکەی ئاگاداربکاتەوە بۆ ئەوەی هیچ کەسێك نەکەوێتە بیدعەکەیەوە وبەهیلاکدا بچێت .

«مەبەست لە پیاوی یەکەم ئەوەیە : کە ئەو نیەتی باشە و مەبەستی چاککردنی خەڵکیە بەڵام ڕێگای

ڕاستی نەگرتووتە بەر، ئەمە بە کەسێکی هەڵەکار دەژمێردرێت، بۆیە هەرکەسێ نیەتی چاکە بێت دەبێت لەسەر ڕێگای ڕاست بێت ڕێگای ڕاستیش وەك الله دەفەرموێت ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ۚ﴾، ئەمە حاڵی زۆربەی ئەو کەسانەیە کە لەخۆیانەوە شت دادەهێنن لەعەقیدەدا، بۆیە ئەم کارە درووست نییە و خاوەنەکەی لەسەر ڕێگای ڕاست نییە با هەر نیەتیشی چاك بێت» .

وە مەبەست لە پیاوی دووەم ئەوەیە : کە ئەو نیەتی باش نییە بەڵکو دەیەوێت خەڵکی بەرەو گومڕایی ببات لەهەمان کاتدا حەق دەناسێت و دەزانێت ئەوەی بۆ دەرچووە کە خۆی ناحەقە بەڵام بە ئەنقەست لەسەر ڕێگای حەق دەردەچێت و مەبەستی گومڕاکردنی خەڵکە .

١٠ - واعلم رحمك اللّٰه أنّه لا يتم إسلام عبد حتى يكون متبعاً مُصَدِقاً مُسَلِّماً فَمَنْ زعم أنه قد بقي شيء من أمر الإسلام لم يَكْفُونَاهُ أَصْحَابُ محمد ﷺ فقد كَذَّبَهُم، وكفى به فُرقةً وطعناً عليهم، وهو مبتدعٌ ضَالٌ مُضِلٌّ، مُحْدِثٌ في الإسلام ما ليس فيه.

بزانە ڕەحمەتی اللّٰه تعالی ـت لێ بێت ئیسلامەتی هیچ بەندەیەك تەواو نابێت تاوەکو شوێنکەوتە و بەڕاست زانو تەسلیم نەبێت هەرکەسێك وابزانێت دەربارەی ئیسلام شتێك ماوە کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ نەیانگەیاندوە ئەوە ئەوانی بەدرۆخستۆتەوە، بەسە بۆ ئەو قسەیە ناکۆکبون و تانەدان لەوان، ئەوە کەسێکی بیدعەکاری گومڕای گومڕاکەرە شتی تازەی لەئیسلامدا داهێناوە کە تێیدانەبوە .

«هەر پێناسەی ئیسلام بریتیە لە : هو الإستسلام الله بالتوحيد واتە : تۆ تەسلیمی الله بیت بە تاکو تەنهایی ئەو بپەرستیت و ملکەچی بکەیت، تا تەسلیم نەبیت ئیسلامەتیەکەت تەواو نابێت، وە نابێت بڵێیت کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەموو شتێکیان نەگەیاندووە چونکە ئەمە مانای ئەوەیە کە ئەوانت بەدرۆ خستۆتەوە ئەمەش گومڕای گومڕاکەرە و بیدعەیە» .

١١ - واعلم رحمك اللّٰه : أَنَّهُ ليس في السُّنَّةِ قياس، ولا يُضرَب لها الأمثال، ولا تتبع فيها الأهواء، وإنما هو التصديق بآثار رسول اللّٰه ﷺ بلا كيف، ولا شرح، لا يقال : لِمَ؟ وكيف؟

وە بزانە ڕەحمەتی اللّٰە ت لێبێت هیچ قیاسێك لەسوننەتدا نییە «**سوننەت لێرەدا مەبەستی عەقیدەیە**»، نمونەشی بۆ ناهێنرێتەوە و شوێنی ئارەزوەکان ناکەوین تێیدا، بەڵکو تەنها باوەڕکردن و بەڕاست زانینی شوێنەواری پێغەمبەری اللّٰە یە ﷺ «**فەرمودەکانی**»، بەبێ چۆنیەتی و بەبێ ڕاڤە بۆ کردن «**ڕاڤە کردنێك کە مانا سەرەکییەکەی بگۆڕێت**»، هەرگیز ناگوترێت : بۆ ؟ چۆن ؟

١٢ - والكلام والخصومةُ والجدالُ والمِرَاءُ مُحْدَث، يَقْدَحُ الشك في القلب، وإن أصاب صاحبه الحقَ والسُّنَّةَ .

وە قسە و وتن «**الكلام**» و ناکۆکی و دوژمنایەتی «**الخصومة**» و گفت و گۆو «**الجدال**» مشت و مڕو «**المراء**» هەموو

داهێنراون گومان دەخەنە دڵەوە، هەرچەندە خاوەنەکەی حەق و سوننەت بپێکێ .

**«مەبەستی ئەوەیە هەرچەندیش لە جیدالەکەش بپێکێ ئەوا هەڵەی کردووە، چونکە ڕێگای ڕاست بریتییە لە تەسلیم بوون و نەچونە ناو جیدال چونکە ڕق کینە درووست دەکات» .**

١٣ - واعلم رحمك اللّٰه : أنَّ الكلام في الرب تعالى مُحْدَث، وهو بدعة وضلالة، ولا يتكلم في الرب إلَّا بما وصفَ به نفسه عز وجل في القرآن، ومَا بَيَّنَ رسول اللّٰه ﷺ لأصحابه، فهو جَلَّ ثناؤه واحدٌ : لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ .

وە بزانە ڕەحمەتی اللّٰه ـت لێبێت کەوا قسەکردن دەربارەی پەروەردگار باسێکی نوێیە، ئەویش داهێنراو و گومڕاییە،

نابێت دەربارەی پەروەردگار قسە بکرێت ئیللا بەو شێوەیە نەبێت خۆی وەصفی خۆی کردووە لە قورئانداو پێغەمبەری اللّٰه ﷺ بۆ هاوەڵانی ڕونی کردوەتەوە، پاك و بێگەردی بۆ ئەو تاك تەنهایە **«هیچ شتێك نییە لەوێنەی ئەو زاتە، وە هیچ شتێك لەو ناچێت، هەر ئەویش بیسەر و بینایە»**

«ئەم بابەتە زۆر گرینگە چونکە زۆربەی گرووپە گومڕاکان لەم جۆرەی تەوحید «**الأسماء الصفات**» تێکەوتن، بۆیە دەبێت بەگوێرەی قورئان و بەوشێوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ هاوەڵانی ڕوونکردۆتەوە ئاوا باسی بکەین» .

١٤ - رَبَّنَا أَوَّلٌ بلا متى، وآخر بلا منتهى، يَعْلَمُ السرَّ وأخفى، و على عرشه استوى، وعلمه بكل مكان، لا يخلو من علمه مكان .

پەروەردگارمان یەکەمینە، بەبێ کەی ؟ دواییینەو بەبێ کۆتایی، «واتە یەکەمینە بەبێ سەرەتا و دواییێنە بەبێ کۆتایی ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ﴾ نهێنی و ئاشکراکان دەزانێ، ئەو لەسەر عەرشەکەی خۆی ئیستوای کردوە و ئاگادارە بەهەموو جێگایەك و هیچ جێگایەك نییە لەعیلمی ئەودا نەبێت» .

«لێرەدا پێویستە شتێکی گرینگ بزانین ئەویش ئەوەیە : کە الله لەهەموو شوێنێکە بە علمی نەك زاتی خۆی چونکە زاتی لەسەر عەرشە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ زۆرێك لەخەڵکی دەڵێن الله لەهەموو شوێنێکە، ئەمە هەڵەیە، بەڵکو الله بەعلمی لەهەموو شوێنێکە نەك زاتی الله ، ئەمە لە کتێبەکانی تری سەلەف زۆر باسیان کردووە» .

١٥ - ولا يقول في صفات الرب : كيف؟ ولِمَ؟ إلا شاكٌّ في اللّٰه تعالى وتعالى .
والقرآن كلام اللّٰه وتنزيله ونوره، ليس بمخلوق لأنَّ القرآن من اللّٰه ، وما كان من اللّٰه فليس بمخلوق، وهكذا قال مالك بن أنس وأحمد ابن حنبل والفقهاء قبلهما وبعدهما، والمراء فيه كفر .

وە هیچ کەسێك دەربارەی سیفاتی اللّٰه ناڵێت : چۆن ؟ ئیللا کەسێکی بەگومان نەبێت لە اللّٰه .
**«نابێ لەهۆکارەکەی و چۆنیەتەکەی بپرسیت کەبۆچی ئاوای فەرمووە تەنیا دەبێت تەسلیم بیت، چونکە تەنیا الله دەزانێت لەچۆنیەتی و هۆکارەکان»**
قورئان کەلامی اللّٰه یە لەلایەن ئەووە دابەزیوە و نوور و ڕوناکی ئەوە، دروستکراو نییە، چونکە قورئان لەلایەن اللّٰه وە هاتووە، هەرشتێك لەلایەن اللّٰه وە هاتبێت دروستکراو نییە، «**مالیك ی**

**کوڕی ئەنەس»** و «**ئەحمەدی کوڕی حەنبەل**» ڕەحمەتی اللّٰه بیان لێ بێ، و ئەوانەی پێش ئەوان و ئەوانەی پاش ئەوان هاتوون لەفەقیهەکان وایان گوتوە، مشت و مڕ کردن تێیدا کوفرە.

١٦ - والإيمان بالرؤية يوم القيامة، يرون اللّٰه عز وجلّ بأبصار رؤوسهم وهو يحاسبهم بلا حِجَاب ولا ترجمَان .

وە باوەڕ بە بینینی اللّٰه تعالی لە ڕۆژی قیامەتدا «**بۆیە دەفەرموێت لە قیامەت چونکە الله لەدونیادا نابینرێت**» اللّٰه تعالی دەبینن بەچاوی سەریان «**ئەمە بۆ ئەوەیە کە نەفی تەئویلی ئەو کەسانە بکات کە دەڵێن: الله دەبینن بەدڵیان نەك بەچاویان**»، ئەویش لێپێچینەوە لەگەڵیان دەکات بەبێ پەردەو بەبێ وەرگێڕ .

١٧ - والإيمان بالميزان يوم القيامة، يوزن فيه الخير والشر، له كفتان ولسان .

وە باوەڕهێنان بەتەرازوو لە ڕۆژی قیامەتدا کەچاکە و خراپەی پێ دەپێورێت و دوو تا و زمانێکی هەیە .

١٨ - والإيمان بعذاب القبر، ومنكرٌ ونكير .

وە باوەڕهێنان بەسزای ناوگۆڕ مونکەرو نەکیر .

**«منكر و نكير : ناوی دوو فریشتەن کە دێن بۆ لای مردوو و پرسیاری ناوی گۆڕیان لێ دەکات» .**

١٩ - والإيمان بحوض رسول اللّٰه ﷺ ، ولكل نبي حَوْض، إلَّا صالح النبي ﷺ ، فإن حوضه ضرع ناقته .

وە باوەڕهێنان بەحەوزەکەی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ و هەموو پێغەمبەرێك حەوزێکی هەیە تەنها «**صالح** عليه السلام» نەبێت چونکە حەوزەکەی ئەو گوانی حوشترەکەی بوو .

**«ئەم وتەیەی دەربارەی پێغەمبەر صالح** عليه السلام **بە حەدیسێکی موضوع هاتووە»** واللّٰه اعلم بالصواب .

٢٠ - والإيمان بشفاعة رسول اللّٰه ﷺ للمذنبين الخاطئين في يوم القيامة، وعلى الصراط، ويخرجهم من جوف جهنم، وما من نبي إلَّا له شفاعة، وكذلك الصديقين والشهداء، والصالحين،

وللّٰه بعد ذلك تفضل كثير، فيمَنْ يشاء، والخروج مِنْ النَّار بعدما احترقوا وصاروا فَحْماً .

وە باوەڕهێنان بە شەفاعەتی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ بۆ تاوانبارە هەڵەکارەکان لە ڕۆژی قیامەتدا، هەروەها لەسەر پردی سیراط شەعافەت دەکات، وە شەفاعەت دەکات بۆ دۆزەخییەکان کە لەناوەڕاستی جەهەننەم دەردەکرێن، هیچ پێغەمبەرێك نیە ئیللا شەفاعەتی خۆی هەیە، هەروەها ڕاستگۆکان وشەهیدکان وپیاوچاکان، لەپاش شەفاعەتی ئەوان اللّٰه تعالی فەزڵێکی زۆری هەیە بۆ هەرکەسێك خۆی بیەوێ، بەدەرکردیان لە ئاگر لەپاش ئەوەی سوتان و بوون بەخەڵوز .

**«مەرجەکانی شەفاعەت :**

**١ . ئەبێت الله ئیزنی پێبدات شەفاعەت بکات .**

٢. ئەوەی شەفاعەتی بۆ دەکرێت دەبێ لە ئەهلی ئیمان بێت و مسوڵمان بێت .

٣. الله لەو کەسە ڕازی بێت کە شەفاعەت دەکات وە لەوکەسەی کە شەفاعەتی بۆ دەکرێت .

شەفاعەت دەکرێت بۆ تاوانە گەورەکان جا بەوەی نەچنە ئاگری دۆزەخەوە یان لێی دەرچن گەر چوونە ئاگرەکەوە» .

٢١ - والإيمان بالصراط على جهنَّمَ، يأخذ الصراط مَنْ شاءَ اللّٰه ، ويَجُوزُ مَنْ شاءَ اللّٰه ، ويسقط في جهنَّمَ مَنْ شاءَ اللّٰه ، ولهم أنوارٌ على قدرِ إيمانهم .

وە باوەڕهێنان بەسیراط لەسەر دۆزەخ، هەرکەسێك اللّٰه تعالى بیەوێت بەسیراتدا دەیبات و ویستی لە کێ بێت تێدەپەڕێت،

هەرکەسێك اللّٰه تعالی بیەوێ دەکەوێتە ناو دۆزەخەوە، ڕوناکییان هەیە هەرکەسەو بەپێی ئیمانەکەی .

٢٢ - والإيمانُ بالأنبياء والملائِكَةِ .

وە باوەڕهێنان بە پێغەمبەران وفریشتەکان .
**«ئەوانەش یەکێکن لە ئەرکانەکانی ئیمان» .**

٢٣ - والإيمانُ بأنَّ الجنَّةَ حَقٌّ، والنَّارَ حَقٌّ، مَخْلُوقَتَانِ، الجنَّةُ في السماءِ السابعةِ، وسَقْفُهَا العَرْشُ، والنَّارُ تحتَ أرضِ السابعةِ السفلى، وهما مخلوقَتانِ، قد علمَ اللّٰه تعالى عددَ أهل الجنّةِ ومَنْ يدخلها، وعددَ أهل النارِ ومَنْ يدخلها، لا تفنيانِ أبداً، هما مع بقاءِ اللّٰه تبارك وتعالى أبد الآبدين، في دهر الداهرين .

وه باوەڕ بەوەی بەهەشت حەقەو ئاگر حەقە، هەردووکیان ئێستا دروستکراون، بەهەشت لەئاسمانی حەوتەمە و سەقفەکەی عەرشی پەروەدگارە، ئاگریش لەژێرەوەی حەوت چینی زەوییە، هەردووکیان دروستکراون، اللّٰه تعالی ژمارەی ئەهلی بەهەشت دەزانێ و ژمارەی ئەوانەی دەچنە بەهەشتەوە و ژمارەی ئەهلی ئاگر و ژمارەی ئەوانەی دەچنە ئاگرەوە دەزانێ، هەرگیز لەناو ناچن و مانەوەیان هەتا هەتایە، مانەوەیان لەگەڵ مانەوەی اللّٰه یە بۆ هەمیشە **«واتە وەك چۆن مانەوەی الله کۆتایی نییە ئاواش مانەوی بەهەشت و دۆزەخ کۆتایی نییە»** .

٢٤ - وآدم عليه السلام كان في الجنّةِ الباقية المخلوقة، فأُخْرِجَ مِنْهَا بعدما عصى اللّٰه عز وجل .

وە ئادەم عليه السلام لەم بەهەشتە دروستکراوە بووە، لەپاش ئەوەی سەر پێچی اللّٰه ی کرد دەرکرا .

٢٥ - والإيمان بالمسيح الدجال .

وە باوڕهێنان بە هاتنی مەسیحی دەججال .

«بۆیە پێی دەوترێ «**المسيح**» بەهۆی خێرا ڕۆیشتنی بەسەر زەویدا کە لەماوەیەکی کەمدا هەموو جیهان دەگەڕێت،

وە پێی دەوترێ دەججال کە لە «**دجل**» هاتووە بەمانای درۆ دێت، بەهۆی ئەوەی زیادەڕۆیی دەکات لە درۆ پێی دەوترێ «**دَجَّال**»» .

٢٦ - والإيمانُ بنزول عيسى بن مريم عليه السلام ، ينزل فيقتل الدّجال ويتزوج ويصلي خلف القائم من آل محمد صلى الله عليه وسلم ، ويموت ويدفنه المسلمون .

وە باوەڕهێنان بەدابەزینی عیسای کوڕی مریەم عليه السلام ، دادەبەزێ و دەججال دەکوژێت، ژن دەهێنێت و نوێژ دەکات لەپشت مەهدییەوە کە لەبنەماڵەی پێغەمبەری اللّٰه یە صلى الله عليه وسلم و دەمرێت وموسڵمانان دەینێژن .

٢٧ - والإيمانُ بأنَّ الإيمانَ قولٌ وعملٌ، وعملٌ وقولٌ، ونيةٌ وإصَابةٌ، يزيدُ وينقصُ، يزيدُ ما شاءَ اللّٰه ، وينقصُ حتى لا يَبْقَى مِنْهُ شيءٌ.

وە باوەڕ بەوەی ئیمان وتە و کردەوە و نیەتە، زیاد دەکات تا اللّٰه تعالی ویستی لەسەر بێت، کەم دەکات تاکو هیچی لێ نامێنێ.

٢٨ - وخير هذه الأمة بعد وفاةِ نبيها أبو بكر، وعمر، وعثمان هكذا رُوِيَ لنا عن ابن عمر قال : ((كُنَّا نقولُ ورسولُ اللّٰه ﷺ بَيْنَ أَظْهُرِنَا : إن خيرَ النَّاسِ بعد رسولِ اللّٰه ﷺ أبو بكر وعمر وعثمان، ويَسْمَع النبي ﷺ بذلك فلا يُنْكِرُهُ)) .

ثُمَّ أفضل النَّاسِ بعد هؤلاءِ : علي، وطلحَةُ، والزبيرُ، وسعدُ بن أبي وَقاصٍ، وسعيدُ بنُ زيدٍ، وعبدُ الرحمن بن عوفٍ، وأبو عُبَيْدَةَ عامر بن الجراح، وكلهم يَصْلُحُ للخلافةِ، ثم أفْضَل النَّاس بعد هؤلاءِ أصحاب رسول اللّٰه ﷺ القرن الأول الذي بُعِثَ فيهم : المهاجرون الأولونَ والأنصار، وهم مَنْ صلى القبلتين، ثُمَّ أفْضَل

النَّاسِ بعد هؤلاءِ مَنْ صَحِبَ رسول اللّٰه ﷺ يوماً أو شهراً، أو سَنَةً، أو أَقَلّ مِنْ ذلك، أو أكثر .

تَرَحَّم عليه، وتَذْكُر فَضْلَهُ، وتَكُفَّ عن زلتهِ، ولا نذكر أحداً منهم إلَّا بخير، تقول رسول اللّٰه ﷺ : ((وإذا ذُكِرَ أَصْحَابي فَأَمْسِكوا)) .

وقال سفيان بن عيينة : ((مَنْ نطقَ في أَصْحَابِ رَسُولِ اللّٰه ﷺ بكلِمَةٍ فهو صاحبُ هوى)) .

وقال النبي ﷺ : ((أصحابي كالنجوم، بِأَيِّهم اقْتَدَيْتُم اهْتَدَيْتُم)) .

وه باشترین کەس لەم ئوممەتەداو لە هەموو ئوممەتەکاندا لەپاش پێغەمبەران ئەبوبەکر ە، ئینجا عومەر ە ئینجا عثمان ە رضي الله عنهم

بەم شێوەیە لە إبن عمر ەوە رضي الله عنهما بۆمان گێڕدراوەتەوە دەڵێت : ئێمە دەمانگوت لەکاتێك کە پێغەمبەری اللّٰە ﷺ لە نێوماندا بوو : باشترین کەس لەدوای پێغەمبەری اللّٰە ﷺ ئەبوبکر و عمر و عثمان ە رضي الله عنهم ، پێغەمبەری اللّٰە ﷺ ئەوەی دەبیست و ئینکاری لێ نەدەکرد .

پاشان باشترین کەس لەدوای ئەوانە : «**علي و طلحة و الزبير و سعد بن أبي وقاص و سعيد بن زيد و عبدالرحمن بن عوف و أبو عبيدة عامر بن الجراح**» هەموویان شایستەی ئەوەن بکرێن بە خەلیفە .

پاشان باشترین کەس لەدوای ئەوانە : هاوەڵانی پێغەمبەری اللّٰە ﷺ ن، سەدەی یەکەم کە پێغەمبەری اللّٰە ی ﷺ تیایدا

ڕەوانەکرا : کۆچەرە یەکەمەکان و پشتیوانان، ئەوانەن کە نوێژیان بەرەو هەردوو قیبلەکە کرد .

پاشان باشترین کەس لەدوای ئەوانە : هەرکەسێك هاوڕێیەتی پێغەمبەری اللّٰه ی ﷺ کردبێ بۆ ڕۆژێك یان مانگێك یان ساڵێك یان کەمتر یان زیاتر .

ڕەحمەتیان بۆ دەنێرین، باسی چاکەکانیان دەکەین، واز لە باسکردنی هەڵەکانیان دێنین، باسی هیچ یەکێك لەوانە ناکەین ئیللا بە چاکە نەبێت لەبەر ئەو وتەیەی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ کە دەفەرموێت : ئەگەر باسی هاوەڵانم کرا ئێوە بێدەنگ بن «**دەبێت زمانمان بگرینەوە لە قسە کردن بەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ، دەبێ بەرگریان لێ بکەین، دەبێ ڕەددی ئەوانە بدەینەوە کە وتەکانی ئەوان پوچەڵ دەکەنەوە یان لە ڕێزیان کەم دەکەنەوە.**

چونکە ناگونجێ لەگەڵ عەقیدەی ئەهلی سوننە و جماعە» .

سفیانی کوڕی عیینە رضي الله عنه دەفەرموێت : هەرکەسێك گەر تەنها بە وشەیەکیش قسەی بە هاوەڵان کرد ئەوا شوێن ئارەزوو کەوتووە «**صاحب الهوی**» یە .

**«واتە تەنها ئەو کەسانەی شوێن ئارەزوو کەوتون قسەیان پێ دەڵێت و تانەیان لێدەدات و دەربارەی ئەوان بە خراپی دەدوێت»**

وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت : هاوەڵانم وەك ئەستێرە وان، هەرکامێکیان بکەنە پێشەنگی خۆتان ئەوا هیدایەت وەردەگرن

**«تێبینی : ابن حزم و البزار و البيهقي ئەم فەرموودەیان بە زەعیف و باطل ناوبردووە»** واللّٰه اعلم بالصواب .

٢٩ - والسَّمَعُ والطَّاعَةُ للأئمة فيما يحب اللّٰه ويرضى ومَنْ وَلي الخلافة بإجماعِ النَّاسِ عليهِ ورضاهم به فهو أمير المؤمنين .

وه گوێڕایەڵی کردنی پێشەوایان لەوەی اللّٰه تعالی پێی خۆشه و پێی ڕازییه و هەرکەسێك خیلافەتی گرته دەست به کۆڕای خەڵکی لەسەر ڕازی بوونیان، ئەوە ئەمیری ئیماندارانه «**مەبەست لە هەڵبژاردن : واته مسوڵمانی ژیر و خاوەنی عەقیدەیەکی پاك هەڵیانبژێرێ، نەك هەموو کەس لە منداڵان و ژنان و شارنشین و دەشتەکی، یاخود کەسانێکی کافر**» .

٣٠ - ولا يَحِلُ لأحدٍ أَنْ يبيتَ ليلة ولا يرى أنَّ عليه إماماً، برَّاً كان أو فَاجِراً .

وە حەڵاڵ نییە بۆ هیچ کەسێك تەنها شەوێك بمێنێتەوە و نەیبینێت کە پێشەوایەکی هەیە، جا لە چاکەکاران بێت یان خراپەکاران .

٣١ - والحَجُّ والغزو مع الإمام ماض، وصلاة الجمعة خلفهم جائزة، ويصلي بعدها ست ركعات، يَفْصِل بين كل ركعتين، هكذا قال أحمد بن حنبل .

وە حەج و غەزا لەگەڵ پێشەوادا بەردەوامە، نوێژی هەینی لەپشتیانەوە دروستە، لەپاش ئەوەش شەش ڕکعات نوێژ دەکرێت، دوو ڕکعات دوو ڕکعات بەجیا دەکرێ، ئا بەم شێوەیە «ئەحمەدی کوڕی حەنبەل» فەرموویەتی .

٣٢ - واالخلافة في قريش إلى أن ينزل عيسى ابن مريم عليه السلام .

خیلافەت لەناو قورەیشدایە تاکو عیسا عليه السلام دادەبەزێ .

٣٣ - ومَنْ خرج على إمام من أئمةِ المسلمين فهو خارجي، وقد شقَ عصا المسلمينَ، وخالفَ الآثارَ وميتته مِيتةً جاهلية .

وە هەرکەسێك دەرچوو لە دژی پێشەوایەك لەپێشەوایانی موسڵمانان، ئەوا دەرچووە و یەکڕیزی موسڵمانانی تێك داوە، پێچەوانەی ئاثاری کردووە، وە مردنەکەی مردنێکی جاهیلییە .

٣٤ - ولا يَحِلُّ قتال السلطان، والخروج عليهم وإن جاروا، وذلك قول رسول الله صلى الله عليه وسلم لأبي ذر الغفاري : ((اصبر وإن كان عبداً

حبشياً))، وقوله للأنصار : ((اصبروا حتى تلقوني على الحوض)) .

وليس في السُّنَّةِ قتال السلطان فإن فيه فساد الدين والدنيا .

وە حەڵاڵ نیە کوشتار بەرامبەر سوڵتان بکرێت و نابێت دەرچیت لە دژی، هەرچەند ستەمی کرد، لەبەر ئەو فەرموودیەی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ بە «**أبوذر الغفاري**» فەرموو : ئارامبگرە، هەرچەندە کۆیلەیەکی حەبەشی بێت و بەپیشتیوانانی «**الأنصار**» فەرموو : ئارامبگرن تاکو پێم دەگەن لەسەر حەوزەکە .

لە سوننەتدا کوشتاری سوڵتان نەهاتووە، چونکە فەسادی دونیاو دینی تێدایە .

٣٥ - ويَحِلُّ قِتَالُ الخوارج إذا عَرَضُوا للمسلمينَ في أَنْفُسِهِم وأموالهم وأهاليهم .

وليس له إذا فارقوه أن يطلبهم، ولا يُجْهِز على جَرِيجهم، ولا يَأخُذ فَيْئَهُم، ولا يَقْتُل أسيرهم، ولا يتبع مُدْبِرَهُم .

وە کوشتاری خەواریج درووستە ئەگەر دەست درێژی بکەن بۆ ماڵ و نەفسی موسڵمانان، ئەگەر وازیان هێنا ئەوا بەشوێنیاندا ناڕۆی، وە بریندارەکانیان ناکوژرێت، وە دەستکەوتەکانیان نابردرێت، وە دیلەکانیان ناکوژرێت، وە ئەوانەی هەڵبێن دوایان ناکەوی .

٣٦ - واعلم رحمكَ اللّٰه أنَّه لا طاعةَ لبشرٍ في معصيةِ اللّٰه عَزَّ وجَلَّ.

وە بزانە گوێڕایەڵی هیچ مرۆڤێك نابێت بکرێت لەسەرپێچی اللّٰه .

«واتە هەرکەسێك فەرمانی پێکردی لەوەی سەرپێچی الله بکەیت جا هەرکەسێك بێت تەنانەت ئەمیری ئیماندارانیش ئەوا نابێت گوێڕایەڵی بکەیت» .

٣٧ - ومَنْ كان من أهل الإسلام، فلا تشهد له بعمل خير ولا شر، فإِنَّكَ لا تدري بم يُخْتَم له عند الموت، ترجو له رحمة اللّٰه ، وتخاف عليه ذنوبه، ولا تدري ما يَسْبِقُ له عند الموت إلى اللّٰه من الندم، وما أحدث اللّٰه في ذلك الوقت إذا مات على الإسلام، ترجو له رحمة اللّٰه ، وتخاف عليه ذنوبه .

وە هەرکەسێك لە ئەهلی ئیسلام بێت، شایەتی بۆ مەدە بەکارێکی چاکی یان خراپی کە کردبێتی، چونکە تۆ نازانی بەچی شتێك کۆتای پێ دێت لەکاتی مردندا، تکا و ڕەجای ڕەحمەتی اللّٰهـت بۆی هەیە و دەترسی لە تاوانەکانی، نازانی چی شتێك

پێشی دەکەوێ لەکاتی مردندا بۆ لای اللّٰە لەپەشیمانی، اللّٰە تعالی چی شتێك دەکات لەو کاتەدا ئەگەر لەسەر ئیسلام مرد، تکای ڕەحمەتت بۆی هەیە و لە ئەنجامی تاوانەکانی دەترسی .

**«مەبەستی ئەوەیە : هەرکەسێك لە ئەهلی ئیسلام بێت ئەوا تۆ نابێت بڵێی ئەوە بۆ بەهەشتە یان بۆ دۆزەخە، چونکە تۆ نازانی بەچ شتێك کۆتایی پێ دێت و دەمرێت، بۆیە باشترین کار ئەوەیە کە گەر کەسێکی باش بوو یان بەسەر کاری باشەوە مرد ئەوا دوعای ڕەحمەتی بۆ بکەین، گەریش تاوانباریش بوو یان بەسەر تاوانەوە مرد ئەوا دوعای لێخۆشبوون و بەزەیی بۆی دەکەین، بەڵام ئەمە تایبەتە بە ئەوانەی ئەهلی ئیسلامن نەك کافرەکان» .**

٣٨ - وما من ذنب إلا وللعبد منه توبة .

وە هیچ تاوانێك نییە ئیللا بەندەكان بۆیان هەیە تەوبەی لێ بکەن.

٣٩ - والرَّجْمُ حَقٌّ .

وە ڕەجم کردن حەقە .

**«ئەو پیاوەی هاوسەری هەیە یان ئەو ئافرەتەی مێردی هەیە گەر زینا بکەن ئەوا ڕەجم دەکرێن چەندین بەڵگە لەم بارەیەوە هەیە، بۆیەش لەو کتێبە عەقیدەیە باس دەکرێت وەکو ڕەدێك بۆ بیدعەکاران کە دەڵێن ڕەجم بوونی نییە، هەرکەس نکۆڵی لێ بکات ئەوا کوفری کردووە» .**

٤٠ - والمَسْحُ على الخفين سُنَّةٌ .

وە مەسح کردن لەسەر هەردوو خوف سوننەتە .

**«چونکە خەوارج پێی وایە مسح لەسەر خوف ناکرێت وەك لە کتێبەکانی سەلەف باسکراوە» .**

٤١ - وتَقْصِيرُ الصَّلاةِ في السَّفَرِ سُنَّةٌ .

وە کورتکردنەوەی نوێژ لەسەفەردا سوننەتە .

**«بۆ ئەوانەی کە غلو دەکەن لەدین و ڕوخسەتە شەرعیەکان وەرناگرن» .**

٤٢ - والصوم في السفر : مَنْ شاءَ صام، ومَنْ شاء أفطر .

ڕۆژوو گرتن لەسەفەر : هەرکەسێك ویستی ڕۆژوو دەگرێت، وە هەرکەسێك ویستی ڕۆژوو ناگرێت .

٤٣ - ولا بأس بالصلاة في سراويل .

وە نوێژکردن بە شەرواڵەوە هیچی تێدا نییە «**دروستە**» .

٤٤ - والنفاق : أن تظهر الإسلام وتخفي الكفر .

وە النفاق «**دووڕوویی**» : بریتیە لەوەی بە زمان ئیسلام دەرخات و لەناخیدا کوفر بشارێتەوە .

٤٥ - واعلم بأن الدنيا دار إيمان وإسلام .

وە بزانە ئەم دونیایە ماڵی ئیمان و ئیسلامە .

**«واتە ئەم دونیایە ماڵی کارکردن و تێکۆشانە لەپێناو الله ، بەڵام ڕۆژی دوایی ماڵی سزا و پاداشتە» .**

٤٦ - وأمة محمد ﷺ فيها مؤمنون في أحكامهم، ومواريثهم، وذبائحهم، والصلاة عليهم .

وە ئوممەتی محمد ﷺ **«واتە ئەو کەسانەی ئیسلامەتییان دەرخستووە»** تێیدا ئیماندار و موسڵمانن لەحوکمەکانیان ومیراتەکان سەربڕینەکان نوێژکردن لەسەریان .

٤٧ - ولا نشهد لأحد بحقيقة الإيمان حتى يأتي بجميع شرائع الإسلام، فإن قَصَّرَ في شيء من ذلك كانَ نَاقِصَ الإيمانِ حتى يتوبَ، واعلم أَنَّ إيمَانَهُ إلى اللّٰه تعالى، تامّ الإيمانَ أو ناقص الإيمانَ إلا ما أظهر لك من تضييع شرائع الإسلام .

وە شایەتی حەقیقەتی ئیمان بۆ هیچ کەسێك نادەین تاکو هەموو یاساکانی ئیسلام جێ بەجێ نەکات، ئەگەر لە هەر شتێکدا کورتڕەوی کرد، ئەوا ئیمانی کەم دەکات تاکو تەوبە دەکات، بزانە ئیمانەکەی بۆ اللّٰه تعالی ئیمانێکی تەواوە یان ئیمانێکی نوقصانە، ئیللا ئەوە نەبێ شتێکی لێ بوەشێتەوە ئیسلامەکەی لەدەست بدات «ئیسلامەکەی پووچەڵ بکاتەوە» .

«واتە تەزکیەی هیچ کەسێك ناکەین بەوەی بڵێین فلان ئیماندارە چونکە لەوانەیە ئەو شایەتی دانە شایستەی نەبێت، بەڵکو ناوە گشتیەکەی پێ دەدرێت و دەڵێین مسوڵمانە، ئیللا مەگەر ئەو مسوڵمانە هەڵوەشێنەرەوەیەك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامی ئەنجام دابێت، ئەوکات تۆ حوکمی مرتدی بەسەردا دەدەیت» .

٤٨ - والصلاة على مَنْ مات مِنْ أهلِ القبلة سُنَّة : المرجوم، والزاني، والزانية، والذي يقتل نفسه، وغيره من أهل القبلة، والسكران وغيره، الصلاة عليهم سُنَّة .

وە نوێژکردن لەسەر ئەو کەسەی بمرێت لەئەهلی قیبلە سوننەتە، وە لەسەر کەسی ڕەجمکراو و ئەو کەسەی زینای کردوە چ پیاو بێت یان ئافرەت و ئەو کەسەی خۆی دەکوژێت و جگە لەوانیش لە ئەهلی قیبلە و سەرخۆش، وە جگە لەویش نوێژکردن لەسەریان سوننەتە.

**«مەبەست لەوەی کە دەفەرموێت : «سوننەتە» واتە لە سوننەتی پێغەمبەری الله یە ﷺ شوێنکەوتنی واجبە» .**

٤٩ - ولا يخرج أحد من أهل القبلة من الإسلام حتى يردَّ آيةً من كتاب اللّٰه عز وجل، أو يردّ شيئاً من آثار رسول اللّٰه ﷺ ، أو يذبح لغير اللّٰه ، أو يصلي لغير اللّٰه ، وإذا فعل شيئاً من ذلك، فقد وجب عليك أن تخرجه من الإسلام، وإذا لم يفعل شيئاً من ذلك فهو مؤمن مسلم بالاسم لا بالحقيقة .

وە هیچ کەسێك لە ئەهلی قیبلە لە ئیسلام دەرناکرێت تاکو ئایەتێك لە قورئان ڕەت نەکاتەوە یان فەرموودەیەکی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ ڕەدنەکاتەوە، یان نوێژ بۆ جگە لە اللّٰه تعالی بکات یان سەر ببڕێت بۆ جگە لە اللّٰه ، جا هەرکاتێك یەکێك لەوانەی ئەنجامدا ئەوا پێویستە لەسەرت لە ئیسلام دەری بکەیت، جا ئەگەر هیچ یەکێك لەوانەی ئەنجام نەدا ئەوا ئیماندار و موسڵمانە

بەناو نەك بەحەقیقەت **«لەرِووی حوكمەكانی دونیاوە نەوەك لەلای الله »** .

٥٠ - وكل ما سمعت من الآثارِ ممّا لم يبلغه عقلك، نحو قول رسول اللّٰه ﷺ : ((قلوب العباد بين أصبعين من أصابع الرحمن عزّ وجلّ)) .

وقوله : ((إن اللّٰه تبارك وتعالى ينزل إلى سماء الدنيا))، و ((ينزلُ يوم عرفة))، و ((ينزل يوم القيامة))، و ((جهنّم لا يزال يطرح فيها، حتى يضع عليها قدمه جلّ ثناؤه))، وقول اللّٰه تعالى للعبد : ((إن مشيت إليَّ هرولت إليك))، وقوله : ((إن اللّٰه تبارك وتعالى ينزل يوم عرفة))، وقوله : ((خلق اللّٰه آدم على صورته))، وقول النبي ﷺ : ((رأيت ربي في أحسن صورة))، وأشباه هذه الأحاديث فعليك بالتسليم والتصديق والتفويض، لا تفسر شيئاً

من هذه بهواك، فإن الإيمان بهذا واجب، فَمَنْ فَسَرَّ شيئاً من هذا بهواه، أو رَدَّهُ فهو جهمي .

وە هەرکاتێك گوێبیستی فەرموودەیەك بووی کە عەقڵت پێی نەدەگەیشت وەکو ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ کە دەفەرموێت : دڵی بەندەکان لەنێوان دوو پەنجەیە لە پەنجەکانی اللّٰه ی میهرەبان وە ئەو فەرموودەیە : اللّٰه تعالی دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا، وە لەڕۆژی عەرەفەدا دادەبەزێ .
وە لەڕۆژی قیامەتدا دادەبەزێ، وە دۆزەخ بەردەوام خەڵکی تێ دەکرێت تاکو اللّٰه تعالی پای خۆی دەخاتە سەر، وە اللّٰه تعالی بە بەندەکەی دەفەرموێت : ئەگەر بە ڕێکردن بەرەو لام بێیت ئەوا بە ڕاکردن بەرەو لات دێم .
وە فەرموودەی : اللّٰه تعالی ئادەمی دروست کردوە لەسەر وێنەی خۆی .

وە پێغەمبەری اللّٰه ﷺ دەفەرموێت : پەروەردگارم بینی لەسەر جوانترین وێنە .

لە نموونەی ئەم فەرموودانە، ئەوا پێویستە لەسەرت تەسلیم بوون و بەڕاست زانین و گەڕاندنەوەی شێوەکەی بۆلای اللّٰه «**واتە تفویض کردن**» و ڕازی بوون، هیچ یەکێك لەوانە بەئارەزووی خۆت تەفسیری مەکە، چونکە باوەڕهێنان بەوە واجبە، جا هەرکەسێك شتێکی لەوانە تەفسیر کرد بە ئارەزووی خۆی یان ڕەتی کردەوە ئەو «**جەهەمی**» یە .

مەبەستی ئیمام لە «**التفویض**» : واتە چۆنیەتەکەی بگەڕێنیتەوە بۆ لای اللّٰه نەك ماناکەی، چونکە المفوضة دوو جۆری هەیە «**المفوضة کیفیة المفوضة المعنی** » : یەکەم ئەوەی کە واتاکەی صحیحە کە لفظ و واتاکە جێگیر دەکات، زانستی چۆنیەتی سیفەتەکە یان ناوە جوانەکانی اللّٰه تعالی دەگەڕێنێتەوە

بۆ لای اللّٰه تعالی بەو شێوەیەی کە شایستەی گەورەیی خۆیتی، کە ئەوانەش سەلەفن .

دووەم ئەوەی کە واتاکەی باتڵە، ئەو کەسانەن کە لفظەکە جێگیر دەکەن، بەڵام لە واتاکەی دەڵێن : ئێمە نازانین مانای چیە، وە نازانین مەبەستی پەروەردگار چیە .

بۆ نمونە

﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ سلف دەڵێن : وجب إثبات لفظاً ومعنى. واتە هەم لەڕووی لفظ «**استواء**» بەمانای «**ارتفع**» ییە، هەمیش واتاکەی کە «**بەرزبوونەوەیە**»، بەڵام چۆنیەتی بەرزبوونەوەی دەگەڕێنینەوە لای اللّٰه بەوەی کە شایەنی گەورەیی ئەوە .

بەڵام ئەهلی باطل دەڵێن : ئێمە وشەکە کە «**استواء**» ییە جێگیر دەکەین، بەڵام واتاکەی کە «**بەرزبوونەوە**» ییە ئێمە نازانین ئەو

واتایەی هەیە، واتە دەڵێن ئێمە نازانین مەبەستی اللّٰە لەوشەی «**استواء**» چییە .

بەڵام مؤولة «**استواء**» دەکەن بە «**استولی**» واتە دەست بەسەرداگرتن .

مؤولة : ئەوانەن ناو و سیفاتەکانی اللّٰە تعالی تەئویل دەکەن و لەمانای خۆی لادەدەن، ئەمەش دوورە لە عقیدە ئەهلی سوننە و جماعە .

٥١ - ومن زعم أَنَّه يرى ربه في دار الدنيا فهو كافر باللّٰه عز وجل.

وە هەرکەسێك باوەڕی وابێت اللّٰە تعالی لەدونیادا دەبینی ئەوا کافرە بە اللّٰە تعالی .

٥٢ - والفِكْرَةُ في اللّٰه تبارك وتعالى بدعة لقول رسول اللّٰه ﷺ : ((تفكروا في الخَلْقِ، ولا تفكروا في اللّٰه ))، فإن الفكرة في الربِّ تَقْدَحُ الشَّكَ في القلب .

وە بیرکردنەوە لەزاتی اللّٰه بیدعەیە، بەبەڵگەی ئەوەی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ دەفەرموێت : «**بیر لەدرووست کراوەکان بکەنەوە بەڵام بیر لە اللە مەکەنەوە**» چونکە بیرکردنەوە لەزاتی اللّٰه تعالی، دەبێتە هۆی دروستبوونی گومان لەدڵەکاندا .

٥٣ - واعلم أنَّ الهَوامَّ والسِّباعَ والدَّوابَّ كلها نحو : الذَّرِ والنَّمْل والذباب، كلها مأمورة لا يَعْمَلونَ شيئاً إلا بإذن اللّٰه تبارك وتعالى.

وه بزانه کەوا هەموو ئاژەڵێك كه نەخۆشی بۆ مرۆڤ درووست دەكات، وه ئاژەڵه دڕەندەكان، وه ئەو ئاژەڵانەی لەسەر زەوی دەڕۆن، وەكو مێرووەكان و مێش و مێرووله، هەمووی اللّٰه بەڕێوەی دەبات، هیچ شتێك نازانن ئیللا به ئیزنی اللّٰه تعالی نەبێت .

«تێبینی **الهوام** : ئەو ئاژەڵانەیە كە نەخۆشی بۆ مرۆڤ درووست دەكەن ، پێیان دەڵێن فەواسق .

**السباع** : ئاژەڵە دڕندەكان شێر و پڵنگ و هتد

**الدواب** : هەموو ئەو ئاژەڵانەی دەڕۆن لەسەر زەوی جا هەر چی بێت» .

٥٤ - والإيمان بأنَّ اللّٰه تبارك وتعالى قد علم ما كان من أول الدّهر، وما لم يكن، وما هو كائن أحصاه اللّٰه وعَدَّهُ عَدَّاً، ومَنْ قال : إنَّهُ لا يعلم ما كان وما هو كَائِنٌ فقد كفر باللّٰه العظيم .

وە باوەڕ بەوەی اللّٰە تعالی زانیویەتی ئەوەی ڕووی داوە لەسەرەتای زەمانەوە، ئەوەشی ڕوونادات، ئەویش کە ڕوودەدات، هەمووی ژماردووە و حسابی کردووە، هەرکەسێك بڵێت : اللّٰە تعالی نازانێت تەنها ئەوە نەبێت کە ڕوویداوە و ئەوەی هەیە، ئەوا کوفری بە اللّٰە تعالی کردوە.

**«واتە ئەو کەسەی بڵێت : الله هیچ زانیارێکی لەبارەی ئەو شتانەوە نەبووە کە ڕوویداوە و لە داهاتووش ڕوودەدەن، ئەوا کافرە بە الله تعالی» .**

٥٥ - ولا نكاح إلَّا بولي وشاهدي عدل وصداق، قَلَّ أو كثر، ومَنْ لَمْ يكن له ولي فالسلطَانُ ولي مَنْ لا ولي لَهُ .

وە «**نیکاح**» هاوسەرگیری دانامەزرێت بەبێ بوونی خاوەن و دوو شایەتی عەدل و مارەییەك جا ئەگەر کەم بێت یان زۆر بێت، هەر

ئافرەتێك خاوەنی نەبێت ئەوا دەسەڵاتدار «**واتە : خەلیفەی موسوڵمانان**» خاوەنی ئەو کەسانەیە کە خاوەنیان نییە .

٥٦ - وإذا طلق الرجل امرأته ثلاثاً فقد حرمت عليه، ولا تحل له حتى تنكح زوجاً غيره .

وە ئەگەر پیاوێك سێ بەسێ خێزانەکەی خۆی تەڵاقدا ئەوا لێی حەرام دەبێت، بۆی حەڵاڵ نابێتەوە تاوەکو شوو بەیەکێکی تر نەکات .

٥٧ - ولا يحل دم امرىء مسلم يشهد أن لا إله إلَّا اللّٰه ، ويشهد أنَّ محمداً عبده ورسوله إلَّا بإحدى ثلاث : زان بعد إحصان، أو مرتد بعد إيمان، أو قتلَ نَفْساً مؤمنة بغير حق فيُقْتل به، وما

سوى ذلك، فدم المسلم على المسلم حرام أبداً، حتى تقوم الساعة .

وە خوێنی هیچ موسڵمانێك حەڵاڵ نییە کە شایەتی دابێت هیچ خوایەك نییە بە حەق جگە لە اللّٰه ، وە محمد ﷺ بەندە و پێغەمبەری ئەوە، ئیللا بەیەکیك لەم سێ خاڵە نەبێت : زینا بکات لەپاش ئەوەی ژنی هێنابێ «**یان شووی کردبێ**» یانلەدینەکەی هەڵگەڕێتەوە پاش ئەوەی ئیمانی هێنابێ یان کەسێکی ئیمانداری بە ناحەق کوشتبێ بۆیە بەهۆی ئەوەوە دەکوژرێ، جگە لەوانە خوێنی موسڵمان بۆ موسڵمان حەرامە تاکو ڕۆژی دوایی .

٥٨ - وكلّ شيء مما أوجب اللّٰه عليه الفناء يفنى إلَّا الجنة والنّار، والعرش والكرسي، واللوح والقلم والصور، ليس يفنى شيء من هذا أبداً، ثم يبعث اللّٰه الخلقَ على ما ماتوا عليه يوم

القيامة، ويحاسبهم بما شاء، فريقٌ في الجنة، وفريق في السعير، ويقول لسائر الخلق ممن لَمْ يُخْلَق للبقاء كونوا تراباً .

وە هەموو شتێك كە اللّٰە تعالى لەناوچوونى پێويست كردووە لەسەرى ئەوا نامێنێ، ئيللا بەهەشت و دۆزەخ و عەرش و كورسى و صور و قەڵەم «**ئەو قەڵەمەى كە الله مقاديرى پێ نوسيوە**» و لەوح « **مەبەستى لوح المحفوظ ە** » نەبێ، ئەوا هيچ لەوانە نەمانيان بەسەردا نايێت، پاشان اللّٰە تعالى خەڵكى زيندوو دەكاتەوە لەسەر ئەو شتەى كە لەسەرى مردوون لە ڕۆژى قيامەتدا، بەوەى خۆى ويستى لەسەر بێت لێپرسينەوەيان لەگەڵدا دەكات، كۆمەڵێك بۆ بەهەشت و كۆمەڵێك بۆ دۆزەخ، پاشان بە هەموو ئەو درووستكراوانەى كە بۆ مانەوە درووست نەكراون دەفەرموێت : ببنە خۆڵ .

٥٩ - والإيمان بالقصاص يوم القيامة بين الخلق كلهم، بني آدم، والسباع، والهوام، حتى للذرة من الذرة، حتى يأخذ اللّٰه عزّ وجل لبعضهم من بعض، لأهل الجنة من أهل النار، وأهل النار من أهل الجنة، وأهل الجنة بعضهم من بعض، وأهل النار بعضهم من بعض .

وە باوەڕبوون بە «**القصاص تۆڵەسەندنەوە**» لە ڕۆژی قیامەتدا لەنێوان هەموو دروستکراوەکاندا، بەنی ئادەم و ئاژەڵە درندەکان و ئەو ئاژەڵانەی نەخۆشی بۆ مرۆڤ درووست دەکەن، تەنانەت مێروولەیەك لە مێروولەیەکی تر، تاکو اللّٰه تعالی حەقیان لەیەکتر وەردەگرێتەوە، بۆ ئەهلی بەهەشت لە ئەهلی ئاگر، بۆ ئەهلی ئاگر لەئەهلی بەهەشت، بۆ ئەهلی بەهەشت لەیەکتر، و بۆ ئەهلی ئاگر لە یەکتر.

« واته الله حەقی هەموو مەخلوقەکانی دەسێنێت، بە ورد و درشتەوە، تەنانەت گەر کەسێکی ئیماندار ستەمی لە کافرێك کردبێ ئەوا الله حەقی لێ دەسێنێتەوە، بەپێچەوانەوەشەوە گەر کافرێك ستەمی لە ئیماندارێك کردبێ، ئەوا الله حەقی لێ دەسێنێتەوە، حەقی کەس لەسەر کەس نامێنێت، بەهەموو گیانەوەرەوەکانیشەوە» .

٦٠ - وإخلاص العمل للّٰه .

وه ئیخلاص ونیاز پاکی له کردەوەکاندا تەنها بۆ اللّٰه بێت.
کردەوەی انسان قبوڵ نابێ تەنیا بەدوو مەرج نەبێ :

١ - **الإخلاص** : واتە کەسەکە ئیماندار بێت و عەقیدەیەکی پاکی ئەهلی سوننە و جماعەی هەبێت، وە ئەو کردەوەیەی کە ئەنجامی دەدات تەنیا بۆ اللّٰە ئەنجامی بدات و دووربێت لە ڕیا .

٢ - **المتابعة** : واتە ئەو کردەوەیەی کە ئەنجامی دەدەیت ئەبێت لەسوننەتدا هاتبێت، پێغەمبەر ﷺ یان یەکێك لە هاوەڵانی کردبێتان، ئەگینا ئەبێتە بیدعە وەك لەم حەدیسە هاتووە : مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ . متفق عليه .

٦١ - والرضى بقضاء اللّٰه ، والصبر على حكم اللّٰه ، والإيمان بما قال اللّٰه عزّ وجلّ، والإيمان بأقدار اللّٰه كلها خيرها وشرها، وحلوها ومرها، قد علم اللّٰه ما العباد عاملون، وإلى ما هم صائرون، لا يخرجون من علم اللّٰه ، ولا يكون في الأرضين ولا في السماوات إلَّا ما علم اللّٰه عزّ وجلّ، وتعلم أن ما أصابك

لم يكن ليخطئك، وما أخطأك لم يكن ليصيبك . ولا خالق مع الله عز وجل .

وە ڕازی بوون بەقەزای اللّٰه تعالی، ئارام گرتن لەسەر حوکمی اللّٰه تعالی، ئیمان هێنان بەوەی اللّٰه فەرموویەتی، وە ئیمان بە هەموو قەدەری اللّٰه بە چاك و خراپی، وە بە شیرین و تاڵیەوە، اللّٰه تعالی زانیویەتی بەندەکانی چی دەکەن، وە بەرەو کوێ دەڕۆن، لە زانستی اللّٰه تعالی دەرناچن، وە لە زەویەکان و ئاسمانەکان هیچ شتێك ڕوونادات ئیللا اللّٰه زانیویەتی، بزانە ئەوەی تووشت بووە نەدەبوایە لێی لابدەیت، وە ئەوەی تووشت نەبووە نەدەبوایە تووشت بێت .

«واتە : ئەو شتەی توشت بووە بزانە کە هەرگیز نەتدەتوانی خۆتی لێ لابدەیت، تاکو تووشت نەبێت، بۆیە هەرگیز نابێت بڵێی : گەر ئاوام کردبا ئەو شتە

**ڕووی نەدەدا، چونکە الله نوسیویەتی کە تووشت ببێ یان تووشت نەبێ»**

وە هیچ درووستکارێك لەگەڵ اللّٰه دا نییە .

٦٢ - والتكبير على الجنائز أربع، وهو قول : مالك بن أنس، وسفيان الثوري، والحسن بن صالح، وأحمد بن حنبل، والفقهاء، وهكذا قال رسول اللّٰه ﷺ .

وە تەکبیر کردن «**واتە : وتنی الله اکبر**» لەسەرجەنازە چوار جارە، ئەمەش وتەی : «**مالیکی کوڕی ئەنەس**» و «**سفیان الثوري**» و «**الحسن ی کوڕی صالح**» «**الحسن بن صالح بن حي** » یەکێکە لەگەورە خەوارجەکان، سفیان الثوري دەربارەی فەرموویەتی : ئەم پیاوە پێی درووست بووە شمشێر بەرز کردنەوە لەسەر ئوممەتی محمد ﷺ ، سەرچاوە : «**تهذيب الكمال**

«**6/190** »» و «**ئەحمەدی کوڕی حەنبەل** »و فەقیهەکان، بەم شێوەیە پێغەمبەری اللّٰه ﷺ فەرموویەتی .

**«ئەمە مەسەلەیەکی فەرعیە بەڵام لەم کتێبە باس کراوە چونکە خیلافی تێدایە، بۆ ئەوەی سوننەت ڕوون بکاتەوە، ئەم کتێبەش بەناوی «شرح السنة» یە، ڕای بڵاو و بەناوبانگی ئەهلی سوننە و جەماعە باس دەکات» .**

٦٣ - والإيمان بأنَّ مع كلِ قَطْرَة ملكاً يَنْزِل مِنْ السَّماءِ، حتى يضعَها حيث أمره اللّٰه عزّ وجلّ .

وە باوەڕ بوون بەوەی کە هەموو دڵۆپەیەکی باران فریشتەیەکی لەگەڵدایە، لە ئاسمانەوە دادەبەزێت تاکو دەیخاتە ئەو جێگەیەی اللّٰه عزوجل فەرمانی پێ کردووە .

٦٤ - والإيمان بأنَّ النبي ﷺ حين كَلَّمَ أَهْلَ القَلِيْبِ يومَ بدرٍ أي المشركين كانوا يسمعون كلامه .

وە باوەڕ بوون بەوەی کاتێ پێغەمبەری اللّٰه ﷺ لەگەڵ ئەهلی «**القليب**» دا قسەی کرد لە ڕۆژی بەدردا واتە بێ باوەڕان ئەوان قسەی پێغەمبەر ﷺ بیان دەبیست .

«دوای ئەوەی کافرەکانی قوڕەیش زۆر ئازاری پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیاندا، ئینجا لە جەنگی بەدر اللّٰه تعالی مسوڵمانانی سەرخست، گەورەکانی قوڕەیش ئەوەی لەو ڕۆژەدا کوژران «**شەیبەی کوڕی عوتبە عوتبەی کوڕی ڕەبیعە ابو جهل ـی کوڕی هشام** » و ژمارەیەك زۆر لەو جەنگەی بەدردا کوژران، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد فڕێیان بدەنە «**قُلیب**»

کە یەکێکە لەبیرەکانی بەدر، پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەوان ڕاوەستاو
قسەی لەگەڵ ئەواندا کرد دەیفەرموو : ئەی فلانی کوڕی فلان،
ئەی ابو جهل ی کوڕی هشام، ئەی عوتبە، ئەی شەیبە، ئەی
ئومەییە، یەك بەیەك قسەی لەگەڵ ئەواندا کرد، ئایە ئەوەی اللّٰه
تعالی بڵێنی پێ دابوون حەق و ڕاست دەرچوو؟
ئەوەی اللّٰه بەڵێنی پێم دابوو حەق و ڕاست دەرچوو، عومەر
رضي الله عنه بە پێغەمبەر ﷺ ی فەرموو : ئەی پێغەمبەری اللّٰه
ﷺ چۆن قسەیان لەگەڵ دەکەیت؟ لەکاتێکدا مردوویەکی
بۆگەنن و نابیستن؟
فەرمووی : هەرگیز ئێوە گوێبیستتر نین لەوەی دەیڵێم بە ئەوان،
بەڵام ئەوان قسە ناکەن .

واتە ئەوانیش چاك قسەكانم دەبیستن بەڵام قسە ناكەن، ئەم باسە لە صحیحی بخاري و مسلم بە تەفاصیلی باسكراوە .

٦٥ - ولإيمان بأن الرجل إذا مرض يأجره اللّٰه على مرضه .

وە باوەڕ بوون بەوەی هەركەسێك ئەگەر نەخۆش بكەوێت ئەوا اللّٰه تعالى پاداشتی دەداتەوە لەسەر نەخۆشییەكەی .

٦٦ - والشهيد يأجره اللّٰه على القتل .

وە شەهید اللّٰه تعالى پاداشتی دەداتەوە لەسەر شەهید بوونەكەی .

٦٧ - والإيمان بأن الأطفال إذا أصابهم شيء في دار الدنيا يألمون، وذلك أنَّ بكر بن أخت عبدالوهاب قال : لا يألمون . وكذَبَ .

وە باوەڕ بوون بەوەی منداڵان ئەگەر تووشی هەرشتێك بێن لەدونیادا ئەوا ئازاریان پێ دەگات، ئەوەتا «**بكر**»ی خوشکەزای عبدالوهاب دەڵێ : ئەوان ئازاریان پێ ناگات، بزانە درۆی کردوە .

**«بۆیە ئەمەی لێرە باسکردووە تا ڕەدی ئەو پیاوە بداتەوە، کە کەسێکی خەواریج بووە، پێی وابووە گەر منالێك تووشی شتێك بێت ئەوا ئازاری پێ ناگات. ئەم بۆچونە نەفامانەیە لەکاتێك خۆشیان بەزانا دەزانن، ئەگینا منالێك کاتێك تووشی شتێك دەبێت هاوار دەکات تاکو پێی بگەن، ئەمەش بەڵگەیە کە ئازاری**

پێدەگات، ئەمە شتێکی بینراو و هەست پێکراوە، بەڵام ئیتر لَا یعقِلُونَ الله المستعان» .

٦٨ - واعلم أنّه لا يدخل الجنّة أحد إلَّا برحمة اللّٰه ، ولا يعذبُ اللّٰه أحداً إلا بذنوبه، بقدر ذنوبه، ولو عذّب اللّٰه أهل السماوات وأهل الأرضين بَرَّهم وفاجرهم، عذبهم غير ظالم لهم، لا يجوز أن يُقال للّٰه تبارك وتعالى إنّه ظالم، وإنما يظلم من يأخذ ما ليس له، واللّٰه جلّ ثناؤه له الخلق والأمر، والخلْقُ خَلْقُه، والدارُ داره، لا يُسأل عمّا يَفعل وهم يُسألون ولا يُقال : لِمَ؟ وكيف؟ لا يدخل أحد بين اللّٰه وبين خَلْقِه .

وە بزانە هیچ کەسێك ناچێتە بەهەشتەوە ئیللا بەڕەحمەتی اللّٰه نەبێ، اللّٰه تعالی سزای هیچ کەسێك نادات ئیللا بەئەندازەی خۆی نەبێ « **واتە بە ئەندازەی ئەوەی کە تاوانی ئەنجام**

**داوە**»، ئەگەر سزای ئەهلی ئاسمانەکان زەوی بدات چاکەکار و خراپەکاران، سزایان دەدات بەبێ ئەوەی ستەمی لێیان کردبێ ، نابێت بە اللّٰە تعالی بگوترێ : ستەمکار، چونکە ئەو کەسە ستەم دەکات کە شتێك ببات و هی خۆی نەبێ، هەموو درووستکراو و بەڕێوەبردنی هەموو بونەوەر هەر بە دەستی ئەوە، دروستکراوەکان دروستکراوی ئەون و ئەم ماڵە ماڵی ئەوە «**ماڵەکان سێ دانەن : ماڵی دونیا ماڵی بەرزەخ ماڵی جێگیر بوون، ئەویش ڕۆژی دواییە**» ، پرسیاری لێ ناکرێ هەرشتێك بکات بەڵکو ئەوان بەرپرسیارن و ناگوترێت: بۆچی و چۆن؟ هیچ کەسێك ناکەوێتە نێوان اللّٰە و دروستکراوەکانی .

«**لەسەرمان تەسلیم بوون و ملکەچ بوونە بەرامبەر بە بڕیارەکانی الله تعالی نەك پرسیارکردن بە بۆچی ئاوا بوو؟ یان چۆن ئاوا درووستکرا؟، ئەم جۆرە**

پرسیارکردنە دوورە لەعقیدەی ئەهلی سوننە و جماعە» .

٦٩ - وإذا سمعت الرجل يطعن على الآثار ولا يقبلها أو ينكر شيئاً من أخبار رسول اللّٰه ﷺ فاتهمه على الإسلام، فإنه رجل رديء القول والمذهب، وإنما طعن على رسول اللّٰه ﷺ وأصحابه لأنّه إنما عرفنا اللّٰه ، وعرفنا رسول اللّٰه ﷺ ، وعرفنا القرآن، وعرفنا الخير والشر، والدنيا والآخرة بالآثار .

وە ئەگەر بیستت کەسێك تانە لە ئەثەر دەدات و وەری ناگرێت یان ئینکاری لە شتێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ دەکات ئەوا تۆمەتباری بکە لەسەر ئیسلام ، چونکە ئەوە کابرایەکی

خاوەن مەزهەب وقسەیەکی خراپە، نابێت هەرگیز تانە لە پێغەمبەری اللّٰه ﷺ و هاوەڵانی بدرێت «**هەرکەس تانە بدات لە پێغەمبەر ﷺ یان هاوەڵان ئەوا کافرە بە الله تعالی**» چونکە ئێمە پێغەمبەری اللّٰه ﷺ و قورئان و چاکە و خراپەی دونیا و دوا ڕۆژمان لەڕێگای ئەثەرەوە «**فەرموودە**»وە ناسیوە .

«بە گشتی تانەدان لە یەك فەرموودەی پێغەمبەری الله ﷺ یان بڵێت پێویستم بە فەرموودە نییە و تەنیا کار بە قورئان دەکەم ئەوا بێ شك کافر و لە ئیسلام چۆتە دەرەوە چونکە وتەی الله ی ڕەتکردۆتەوە کە فەرمانمان پێدەکات گوێڕایەڵی پێغەمبەر بکەین» .

٧٠ - وأنّ القرآن إلى السنة أحوج من السنة إلى القرآن .

وە قورئان زیاتر پێویستی بەسوننەت هەیە لەوەی سوننەت پێویستی بە قورئان بێت .

**«چونکە سوننەت ڕوونکەرەوە و تەفسیری قورئانە، وەکو نوێژ لە قورئان باسی نوێژ کراوە بەڵام باسی چۆنیەتەکەی نەکراوە بۆیە ئەبێت بگەڕێینەوە بۆ فەرموودە بۆ ئەوەی چۆنیەتەکەی بزانین. وە چەندین ڕوونکەرەوەی تریش» .**

٧١ - والكلام والجيدال والخصومة في القدر خاصة منهي عنه عند جميع الفرق : لأن القدرَ سِرُّ اللّٰه ، ونهى الرب تبارك وتعالى الأنبياء عن الكلام في القدر، ونهى رسول اللّٰه صلى اللّٰه عليه وسلم عن الخصومة في القدر، وكرهه أصحاب رسول اللّٰه

والتابعون، وكرهه العلماء وأهل الورع، ونهوا عن الجدال في القدر: فعليك بالتسليم والإقرار والإيمان، وإعتقاد ما قال رسول اللّٰه في جملة الأشياء، وتسكت عمّا سوى ذلك.

وە قسەکردن و ڕکابەری و مشت و مڕ کردن بەتایبەتی لە قەدەردا نەهی لێ کراوە لەلایەن هەموو گرووپ و کۆمەڵەکانەوە، چونکە قەدەر نهێنی اللّٰهیيە، پەروەردگار نەهی کردوە لە پێغەمبەران قسە لە قەدەردا بکەن ، پێغەمبەری اللّٰه ـش ﷺ نەهی کردووە لە مشت و مڕ کردن لە قەدەردا، وە هاوەڵانی پێغەمبەری اللّٰه ـش ﷺ حەزیان لێ نەکردوە و شوێنکەوتوانیش حەزیان لێ نەکردوە، زانایان و ئەهلی وەرع حەزیان لێ نەکردوە نەهییان کردوە لە «**جیدال**» کردن لە قەدەردا ، بۆیە ئەوەی لەسەرتە تەسلیم بوون و دان پێدانان و باوەڕهێنانە پێی، باوەڕ بەوەی پێغەمبەری اللّٰه

ﷺ فەرموویەتی لەنێو کۆمەڵێ شتدا، وە بێ دەنگ بە لە جگە لەوانە .

**«باوەڕهێنان بە قەزاو قەدەر یەکێکە لە ئەرکانی ئیمان، وە هەرگیزیش نابێت قسەی دەربارەی بکەین جگە لەوەی لە قورئان یان لە فەرموودەکان یان وتەی سەلەف باسکراوە، وە مشتومڕ کردن لە قەدەر تووشی گومڕاییت دەکات چونکە هەرگیز ناگەیتە ئامانج، تەنیا ئەبێت تەسلیم و ملکەچ بین» .**

٧٢ - والإيمان بأن رسول اللّٰه صلى اللّٰه عليه وسلم أُسري به إلي السماء، وصار إلى العرش، وكلم اللّٰه تبارك وتعالى، ودخل الجنة، واطَّلَعَ إلى النار ورأى الملائكة، وسمع كلام اللّٰه عزّ وجلّ، ونُشِرَت له الأنبياء، ورأى سرادقات العرش الكرسي، وجميع ما في السماوات، وما في الأرضين، و اليقظة حمله جبريل

على البراق حتى أداره في السماوات، وفرضت له الصلاة في تلك الليلة، ورجع إلى مكة في تلك الليلة، وذلك قبل الهجرة .

وه باوەڕبون بەوەی کە پێغەمبەری اللّٰه ﷺ ئیسڕای «**ئیسڕا** : **واتە شەوڕەوی، کە بە شەو ئیسڕای پێکرا لە «المسجد الحرام» ەوە لە مەککە بۆ «المسجد الأقصى» لە فەڵەستین**» بۆ ئاسمان و ڕۆیشت بەرەو عەڕش، لەگەڵ اللّٰه تعالى قسەی کردو چووە بەهەشتەوە و ئاگری بینی و فریشتەی بینی و قسەی اللّٰه تعالى ی بیست و پێغەمبەرانی بۆ کۆکرایەوە، دەوروبەری عەڕش و کورسی و هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بینی بە ئاشکراو بە بەئاگایی «**ئەمە ڕەددە بۆ ئەوانەی کە دەڵێن بە خەو بووە**»، جبریل لەسەر پشتی بوراقدا «**بـوراق وڵاخێکە**» هەڵیگرت تاکو بە ئاسمانەکاندا

گەڕاندی ئەو شەو پێنج نوێژەکەی لەسەر فەرزکراو هەر ئەو شەوە گەڕایەوە مەککە، ئەمەش لەپێش هیجرەت ڕوویدا .

«تێبینی میعراج : بریتیە لە چونە سەرەوە، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ لە « **بيت المقدس**»ەوە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان و حەوت چینەکەی ئاسمانی تێپەڕاند و گەیشتە «**سدرة المنتهى**»، گوێی لە قسەی الله بوو، الله لەم شەوە فەرمانی نوێژی پێ کرد، بەهەشت و دۆزەخی بینی، وە پێغەمبەرانی عليهم السلام لە ئاسمانەکاندا بینی، الله تعالى ـش ئەوانی کۆکردەوە ئەویش «**واتە پێغەمبەر** ﷺ » پێش نوێژی بۆ کردن، وەك دەرخستنی فەزڵ بەسەر ئەواندا، هەر لەم شەوە پێنج نوێژەکەی لەسەر فەرز کرد، ئینجا ئەزیزمان ﷺ دابەزی بۆ «**بيت المقدس**» دواتر لە «**بيت المقدس**» ەوە

گەڕایەوە بۆ «**مەككە**» بەیەك شەو ئەمە هەمووی بە توانا و دەسەڵاتی الله بوو كە هیچ شتێك لەژێر دەستی دەرناچێ، ئەو شەوە پێغەمبەر ﷺ لە مەككە ڕۆژی كردەوە. ئەمە تەنیا وەك بەرچاو ڕوونیەكە ئەگینا ئەثەر زۆرن لەم بارەوە كە بەجوانی باسی دەكەن» .

٧٣ - واعلم أن أرواح الشهداء في قناديل تحت العرش تسرح في الجنة، وأرواح المؤمنين تحت العرش، وأرواح الكفار والفجار في بَرَهُوْت، وهي في سجين .

وە بزانە ڕوحی شەهیدەكان وا لە ناخی باڵندەی سەوزدا لە بەهەشتدا دەگەڕێن، دەگەڕێنەوە بۆ چراكانی ژێر عەرش، ڕۆحی خراپەكاران و بێ باوەڕان لەبیری برهوت دان، كەئەویش

ئاگری دۆزەخە «**ئاگری دۆزەخ ناوی زۆرە سجين يان برهوت والله اعلم بالصواب**»

٧٤ - والإيمان بأن الميت يعقد في قبره، ويرسل اللّٰه فيه الروح حتى يسأله منكر ونكير عن الإيمان وشرائعه، ثُمَّ يُسَلّ روحه بلا ألم، ويعرف الميت الزائر إذا أتاه، ويُنَعَّم في القبر المؤمن، ويعذّب الفاجر كيف شاء اللّٰه .

وە باوەڕبوون بەوەی مردوو لە گۆڕەکەیدا دادەنیشێندرێت و رۆحەکەی بۆ دەگێڕدرێتەوە تاکو «**منكر ونكير**»پرسیاری لێ دەکەن دەربارەی ئیمان و شەریعەتەکانی ئینجا ڕۆحەکەی لێ دەردەچێ بەبێ هیچ ئازارێك . مردوو دەزانێ هەرکەسێك سەردانی بکات، کەسی ئیماندار لەگۆڕەکەیدا لەخۆشیدایە و

سزای خراپەکار دەدرێت بەو شێوەیەی اللّٰە تعالی ویستی لێ بێت .

« لێرەدا چەند شتێك ڕوون دەبێتەوە :

١ - باوەڕ بەوەی مردوو لەناو گۆڕ دادەنیشێندرێت .

٢ - منكر و نكير : دوو فریشتەن لەناو گۆڕ پرسیار لە بەندە دەکەن .

٣ - سەردانی کردنی گۆڕ درووستە بەڵام نابێ زیادەڕۆیی تیا بکرێ و بکرێتە عادەت، بەڵکو ببێتە تەزکیەی نەفس.

4 - باوەڕ بە سزا و خۆشی ناو گۆڕ، کە کۆمەڵەیەك لە موعتەزیلە ئەمە ڕەت دەکەنەوە» .

٧٥ - واعلم أن الشر والخير بقضَاءِ اللّٰه وقَدَرِهِ .

وە بزانە چاکەو خراپە بە قەزاو قەدەری اللّٰە ڕوو دەدەن .

«هەرشتێك ڕوودەدات لەم جیهانە لەخۆیەوە نییە بەڵكو نوسراوە لە «**لوح المحفوظ**» بەچاك و خراپ، وە بە سوود و قازانج، بە برسێتی و تێربوون، بە هەژاری و دەوڵەمەندی هتد، گشتی لەلایەن الله تعالی هوەیە» .

٧٦ - والإيمان بأنَّ اللّٰه تباركَ وتعالى هو الذي كلم موسى بن عمران يوم الطور، وموسى يسمع من الكلام بصوت وقع في مسامعه منه لا من غيره، فمن قال غير هذا : فقد كفر باللّٰه العظيم .

وە باوەڕبوون بەوەی اللّٰه تعالی لەگەڵ موسای كوڕی عیمراندا قسەی كرد لە ڕۆژی الطور و موساش گوێی لەقسەكانی اللّٰه بوو بەدەنگەوە گەیشتە گوێی موسا، لەجگە لە اللّٰه وە نەبوو، جا

هەرکەسێك، جگە لەم قسەیە بکات ئەوا کوفری بە اللّٰە تعالى کردوە .

**«ئەمە ڕەددە بۆ جەهمی و موعتەزیلەکان کە دەڵێن: الله تعالی قسە ناکات گەر قسە بکات کەواتە مەخلوقە والعیاذبالله . ئەمە وتەی ئەو بێ عەقڵانەیە، لە ڕاستیدا الله تعالی قسە دەکات بە قسەکردنێ کە ببیسترێ، وە قورئانیش وتەی الله ـییە، ئەمەیە عقیدەی ئەهلی سوننە و جماعە دەربارەی قسەکردنی الله » .**

٧٧ - والعقل مولود، أُعطي كل إنسان من العقل ما أراد اللّٰه ، يتفاوتون في العقول مثل الذرة في السماوات، ويطلب من كل إنسان من العلم على قدر ما أعطاه من العقل، وليس العقل باكتساب، إنما هو فضل من اللّٰه تبارك وتعالى .

وه عەقڵیش دروستکراوه، اللّٰه تعالی بەئەندازەی ئەوەی بیەوێ عەقڵی بەخشیوەتە انسان، جیاوازن لە عەقڵەکانیاندا وەکو گەردیلە لەئاسمانەکاندا، بەئەندازەی ئەوەی اللّٰه تعالی عەقڵی بە انسان بەخشیوە اللّٰه تعالی داواکاری لێ دەکات عەقڵ بەهەوڵدان نییە بەڵکو ئەوە فەزڵی اللّٰه ییە .

٧٨ - واعلم أن اللّٰه فضَّلَ العبادَ بعضهم على بعض في الدين والدنيا، عدلاً منه لايُقالُ : جار ولا حابي، فمن قال : أن من فضل اللّٰه على المؤمن والكافر سواء : فهو صاحب بدعة، بل فضَّل اللّٰه المؤمين على الكافرين، والطائع على العاصي، والمعصوم على المخذول، عدل منه، هو فضله يعطي من يشاء، ويمنع من يشاء .

وە بزانە اللّٰه تعالی فەزڵی بەندەکانی داوە بەسەر یەکتردا لە دونیا و دوارۆژدا، ئەمەش لەدادپەروەری ئەوەو ناگوترێت: ئەو ستەمی کردوە و لایەنگیری لایەکیانی کردوە، هەرکەسێ بڵێت : فەزڵی اللّٰه تعالی بەسەر ئیماندارو بێ باوەڕدا وەکو یەکە ئەوە بیدعەچییە بەڵکو اللّٰه تعالی فەزڵی ئیمانداری داوە بەسەر بێ باوەڕاندا، گوێڕایەڵان بەسەر سەرپێچیکاراندا، وە کەسی پارێزراو بەسەر کەسی دواکەوتوودا، ئەمەش دادپەروەری ئەوە، ئەوە فەزڵی خۆیەتی دەیبەخشێتە هەرکەسێ ویستی لێ بێت، وە لەهەرکەسێ بیەوێت دەیگرێتەوە .

٧٩ - ولا يحل أن تكتم النصيحة للمسلمين برهم وفاجرهم في أمر الدين، فَمَنْ كتم : فقد غش المسلمين ، ومن غش المسلمين : فقد غش الدين، ومن غش الدين : فقد خان اللّٰه ورسوله والمؤمنين .

وە حەڵاڵ نییە ئامۆژگاری لەهیچ موسڵمانێك بشاردرێتەوە، چاکەکاران وخراپەکارانیان لەهەر کارێك لەکاروباری ئەم دینە، جا هەرکەسێك شاردییەوە ئەوا غەشی لە موسڵمانان کردوە هەرکەسێك غەش لەموسڵمانان بکات ئەوا غەشی لەدین کردوە و هەرکەسێك غەش لەدین بکات ئەوا خیانەتی لە اللّٰە و پێغەمبەر و ئیمانداران کردووە.

«**ئامۆژگاری«النصیحة»** دینە، **جا دژی النصیحة**» بریتییە لە غەش ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : إِنَّمَا الدِّينُ النَّصِيحَةُ . قَالُوا : لِمَنْ يَا رَسُولَ اللّٰه ؟ قَالَ : " لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ، وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ . صحيح .

ئامۆژگاری بۆ اللّٰە و پێغەمبەر ﷺ ئەمە لە عەقیدەدا، کە دەبێت عەقیدەیەکی پاکی هەبێت و دووربێت لە شرك و هیچ

بیدعەیەکی تێدا نەبێ، وە شوێنکەوتەی پێغەمبەر بێت، ئەوا کەسی ئامۆژگاری کارە بۆ اللّٰه و پێغەمبەرەکەی ﷺ .

ئامۆژگاری کردن بۆ پێغەمبەری اللّٰه ﷺ بریتییە لە باوەڕبوون بە پەیامەکەی و خۆشویستنی و ڕێز لێگرتنی، وە پێشخستنی قسەی ئەو لەقسەی هەرکەسێکی تردا، وە وازهێنان لە بیدعە، باوەڕبوون و بەڕاست خستنەوەی ئەو هەواڵانەی پێی داوین لەباسە غەیبیەکان، دوورکەوتنەوە لەوەی نەهی لێ کردووین .
ئامۆژگاری کردنی پێشەوای ئیمانداران کە ئەویش بە گوێڕایەڵی کردنیان لە کاری چاکە و لەدژی دەرنەچی و بەدوای عەیبەکانی نەکەوی و بەناو خەڵك بڵاوی بکەیتەوە، جا ئامۆژگاری کردنی ەوان ئەوەیە: گەر علم و توانات هەبوو دوو بەدوو ئامۆژگاریان بکەیت، هەڵەکانیان پێ بگەینی و پێیان بڵێیت، یان بە ژێردەستەکانی و ئەوانیش بەوان بگەیەنن، بەڵام گەر لەناو کۆڕ و

مەجلیس باسیان بکەیت ئەبێتە غەش، واتە ئەبێت لەلایەن خۆتەوە بگەیەنیتە ئەوان .

٨٠ - واللّٰه تبارك وتعالى سميع بصير عليم، يداه مبسوطتان، قد عَلِمَ اللّٰه أنَّ الخلقَ يعصونه قبل أن يخلقهم، علمه نافذ فيهم، فلم يمنعه علمه فيهم أن هداهم للإسلام، ومن به عليهم كرماً وجوداً وتَفَضُّلاً، فله الحميد .

وە اللّٰه تبارك وتعالى بیسەرو بینەر و زانایە، دەستەکانی واڵان، زانی بەندەکانی سەرپێچی دەکەن پێش ئەوەی دروستیانی کردبێ، زانینی ئەو دەربارەیان کاریگەرە، ئەو زانینەی خۆی بەرانبەریان ڕێگر نەبوە بۆ هیدایەت دانیان بۆ ئیسلام، منەتی خۆی ڕژاندوە بەسەریاندا وەکو بەخشندەیی ومیهرەبانی وفەزڵێك بۆیە سوپاس ستایش تەنها بۆ ئەوە .

«لێرەدا باسی سێیەم جۆری تەوحید دەکات کە الأسماء والصفات ـە کە سیفاتی بیستن و بینین و دەست بۆ الله باس دەکات» .

٨١ - واعلم أنَّ البشارَةَ عند الموتِ ثلاث بشارات يُقَالُ : أبشر يا حبيبَ اللّٰه برضى اللّٰه والجنّة، ويُقالُ : أبشر يا عدو اللّٰه بغضب اللّٰه والنار، ويُقَالُ : أبشر يا عبد اللّٰه بالجنة بعد الإسلام . هذا قول ابن عباس .

وە بزانە موژدەدان لەکاتی مردندا سێ موژدەدانە :
دەڵێن : موژدەت لێبێ ئەی خۆشەویستی اللّٰه بەڕازی بوونی اللّٰه و بەهەشت .
دەڵێن : موژدەت لێبێ ئەی دوژمنی اللّٰه بەتووڕە بوونی اللّٰه و ئاگر.

دەڵێن : موژدەت لێبێ ئەی بەندەی اللّٰه بە بەهەشت لەپاش تۆڵە لێ سەندنەوە «**بەهۆی تاوانەکانییەوە**». ئەمە قسەی«**إبن عباس** رضي الله عنهما »یە .

٨٢ - واعلم أنَّ أولَ مَنْ ينظر إلى اللّٰه تعالى في الجنَّةِ الأضِرَّاءُ، ثُمَّ الرجال، ثم النساء، بأعين رؤوسهم، كما قال رسول اللّٰه ﷺ : ((إنكم سترون ربكم كما ترون القمر ليلة البدر، لا تُضامون في رؤيته))، والإيمان بهذا واجب وإنكاره كفرٌ .

وە بزانە یەکەم کەسێك تەماشای اللّٰه دەکەن لە بەهەشتدا نابیناکانن، ئینجا پیاوان، ئینجا ئافرەتان، بەچاوی سەریان، هەروەکو پێغەمبەری اللّٰه فەرموویەتی«**إنكم سترون ربكم**

**كما ترون القمر ليلة البدر لا تضامون في رؤيته متفق عليه**» باوڕ بوون بەمە واجبە و ئینكاری كردنی كوفرە .

٨٣ - واعلم رحمك اللّٰه أنّه ما كانت زندقة قط، ولا كفر، ولا شك، ولا بدعة، ولا ضلالة، ولا حيرة في الدين إلَّا من الكلام، وأهل الكلام، والجدل، والمراء، والخصومة .
والعجب كيف يجترىء الرجل على المراءِ والخصومةِ والجدالِ واللّٰه تعالى يقول : مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا، فعليك بالتسليم، والرضى بالآثار وأهل الآثار، والكف، والسكوت .

وە بزانە زەندەقە و كوفرە وگومان وبیدعەو گومڕایی لەدیندا نەبووە ئیللا لە كەلام و ئەهلی كەلام و ململانێ و دەمبازی و مشت ومڕ و ناكۆكیەوە نەبێ.

سەرسامی لەوەدایە چۆن کەسێك جورئەتی مشت و مڕ و ناکۆکی و جیدال دەکات لەکاتێکدا اللّٰه تعالی دەفەرموێت : ﴿مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ واته : هیچ کەس لەبەرامبەر ئایەتەکانی اللّٰه مجادله و دەمەدەمێ ناکات جگە لەوانەی بێ باوەڕن .

جا ئەوەی لەسەرتە تەسلیم بوون و ڕازی بوون بە فەرمودەکان و وازهێنان و بێ دەنگییە .

«پێویستە تەنیا تەسلیم بیت، وە وازهێنان لە مناقشە و گومانکردن، چونکە تۆ نەهیت لێ کراوە لەوە، علم بۆ مناقشە و ڕەددانەوە کۆمەکەوە بەڵکو بۆ پەروەردەکردنی خۆت کە عقیدەت لەسەر وتەی الله و پێغەمبەر و پێشەوایانی سەلەف بێت .

عبدالله کوڕی یسري ڕەحمەتی الله ی لێبێت ئەفەرموێت : سونەت ئەوە نییە کە تۆ ڕەدی ئەهلی بیدەع

بدەیتەوە، بەڵکو ئەوەیە کە تۆ گفتت لەگفتیان نەگەڕێ و نزیکیان نەکەویتەوە ال‌إبانة ل‌إبن بطة» .

٨٤ - والإيمان بأنَّ اللّٰه تبارك وتعالى يُعَذب الخلقَ في النار، في الأغلال، والأنكال، والسلاسل، والنار في أجوافهم، وفوقهم، وتحتهم، وذلك أن الجهمية منهم هشام الفُوْطِي قال : إنما يُعذِّب اللّٰه عند النار . رَدٌّ على اللّٰه وعلى رسوله .

وە باوەڕ بەوەی اللّٰه تعالى خەڵکی سزا دەدات لە ئاگردا، لە کۆت و زنجیرە و ئاگر لەناخیاندایە و لەسەرەوە و لە خوارەوەیانەوە، چونکە جەهمییەکان لەوانە «**هشام الفوطي**»دەڵێت : اللّٰه خەڵکی سزا دەدات لەتەنیشت ئاگر، ئەمەش ڕەدی قسەی اللّٰه تعالى و پێغەمبەرەکەیەتی .

ڕوونکردنەوەیەك

الأغلال : واتە ئەوان دەستیان تاکو گەردنیان بە کۆت و زنجیر دەبەسترێتەوە. وەك اللّٰە تعالی ئەفەرموێت : ﴿إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ وَأَغۡلَٰلٗا وَسَعِيرًا﴾ پەنا بە اللّٰە تعالی.

الأنكال : ئامێرەکانی سزادانە کە زنجیر و کۆت و ئاگرە. وەك اللّٰە تعالی ئەفەرموێت : ﴿إِنَّ لَدَيۡنَآ أَنكَالٗا وَجَحِيمٗا ١٢﴾

پەنا بە اللّٰە تعالی لەو سزا سەختە .

٨٥ - واعلم أنَّ الصلاة الفريضة خمس صلوات، لا يُزَادُ فِيهنَّ، ولا يُنْقَصُ في مواقيتها، وفي السفر ركعتان إلَّا المغرب، فمن قال أكثر من خمس فقد ابتدع، ومن قال : أقل من خمس فقد ابتدع، لا يقبل اللّٰه شيئاً منها، إلَّا لوقتها، إلَّا أن يكون نسياناً فإنه معذور يأتي بها إذا ذكرها، أو يكون مسافراً فيجمع بين الصلاتين إن شاء.

وه بزانه نوێژه فەرزەکان پێنج نوێژن، لەوانه زیاد ناکرێت وکەم ناکرێتەوه لەکاتەکانیاندا، لەسەفەردا دوو ڕکاته، تەنها مەغریب نەبێ، جا هەر کەسێك بڵێت : نوێژەکان لەپێنج فەرز زیاتره ئەوا بیدعەی کردوه. وەهەر کەسێك بڵێت : نوێژەکان لەپێنج فەرز کەمتره ئەوا بیدعه کردووه، اللّٰه تعالی وەرناگرێت ئیللا له کاتی خۆیدا نەبێ، ئیللا مەگەر کەسێك له بیری چووبێت ئەوا عوزری هەیه، کاتێ بیری هاتەوه ئەوا ئەنجامی دەدات، یان موسافیر بێت ئەوه لەنێوان دوو نوێژدا کۆدەکاتەوه ئەگەر بیەوێ .

«باسی نوێژ یەکێکە لەدووەم پایەی ئیسلام لە دوای شایەتمان، بۆیە هەرکەسێك وازی لێبهێنێ و باوەڕی بە واجب بوونی نەبێ ئەوا کافرە بە ئیجماعی مسوڵمانان کە بەڵگە دەربارەی زۆر هاتووە، وە ئەوکەسەشی باوەڕی بە واجب بوون هەیە و نایکات لەتەمبەڵی ئەوا لەسەر قسەی ڕاست کافرە .

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : بين العبد وبين الكفر ترك الصلاة رواه مسلم . واتە : نێوان بەندەکان و کوفر وازهێنانە لە نوێژ » .

٨٦ - والزكاة من الذهب والفضة، والتمر والحبوب، والدواب، على ما قال رسول اللّٰه ﷺ ، فإن قسمها فجائز، وإن أعطاها الإمام فجائز .

وە زەکاتدان لەئاڵتون و زیو و خورما و دانەوێڵە و وڵاخدا هەروەکو پێغەمبەری اللّٰە ﷺ فەرمویەتی، جا ئەگەر خۆی دابەشی بکات ئەوا دروستە، وە ئەگەر بیداتە پێشەوای ئیمانداران ئەوا دروستە .

٨٧ - واعلم أَنَّ أولَ الإسلام : شهادة أن لا إله إلا اللّٰه ، وأَنَّ محمداً عبده ورسوله .

وە بزانە یەکەم پایەی ئەم ئیسلامە : شایەتی دانە بەوەی کە هیچ خودایەك نییە بەحەق کە شایەنی پەرستن بێت جگە لە اللّٰه ، وە محمد ﷺ یش بەندە و نێردراوی ئەوە .

«مانای شایەتی **لا إله إلا الله** : باوەڕت ببێ بەدڵت و زمانت بیڵێی و دانی پێدا بنێیت کەوا هیچ خودایەك نییە بەحەق کە شایەنی پەرستن بێت جگە لە الله ، هەر پەرستراوێك جگە لەو باطل و پوچەڵە .
مانای شایەتی محمد رسول الله : دان بەوەدا بنێیت بە ئاشکراو نهێنی کەوا محمد نێردراوی الله ـیە، بەڵام گەر کەسێك بە زمان گوتی و لەناخیدا باوەڕی بە پەیامەکەی نەبوو ئەوا دووڕووە «**منافق**»ە» .

٨٨ - وأَنَّ ما قال اللّٰه كما قال، ولا خُلْفَ لِمَا قال، وهو عند ما قال .

ئەوەی اللّٰه فەرموویەتی هەر ئەوەیە کە ئەو فەرموویەتی، وە هەر بەڵێنێکی دابێت جێبەجێی دەکات و دەیباتە سەر .

«الله تعالی هەر بەڵێنێکی دابێت ئەوا هیچ پەشیمان نابێتەوە و جێبەجێی دەكات وەك الله تعالی ئەفەرموێت ﴿وَعۡدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ﴾ ئەگەر هەڕەشەی دا ڕەنگە لێی خۆشنەبێ، چونکە جیاوازی هەیە لەنێوان بەڵێن و هەڕەشە .

بەڵێن : هەرگیز الله لێی پەشیمان نابێتەوە. بەڵام هەڕەشە : ڕەنگە هەڕەشەکە جێبەجێ نەکات و لێی خۆشبێ بە فەزڵ و ڕەحمەتی خۆی، وە ڕەنگە جێبەجێی بکات لەسەری بە عەدلی خۆی » .

٨٩ - والايمان بالشرائع كلها .

وە باوەڕبوون بەهەموو شەریعەتەکان.

**«واتە ئێمە باوەڕ بە هەموو شەریعەتەکانی الله تعالی بێنین، باوەڕ بەوەی کە الله بۆ هەموو کاتێك شەرعێك دادەنا ئینجا بە شەریعەتەکەی تر نەسخی دەکاتەوە بگونجێ لەگەڵ ئەوانەی دوای ئەوان دێن، کاتێ پێغەمبەر محمد ڕەوانەکرا شەریعەتێکی چەسپیو و دامەزراوی هێنا تاکو ڕۆژی قیامەت و نەسخ نابێتەوە و هەرگیز ناگۆڕێت و دەگونجێ بۆ هەموو کات و شوێنێك» .**

٩٠ - واعلم أَنَّ الشراءَ والبيعَ ما بيع في أسواق المسلمين حَلَالٌ ما بيع على حكم الكتاب والإسلام والسنة، مِنْ غيرِ أنْ يَدخلَهُ

تغيير، أو ظلم، أو جَوْر، أو غدر، أو خلاف للقرآن، أو خلاف للعلم.

وە بزانە کڕین و فرۆشتن حەڵاڵە ئەگەر لە بازاڕی موسڵماناندا فرۆشرا لەسەر حوکمی قورئان و سوننەت، بەبێ ئەوەی خەڵەتاندن و ستەم و غەدری تێکەڵ بێت یان جیاواز بێت لەگەڵ قورئاندا، یان جیاواز بێت لەگەڵ عیلمدا .

٩١ - واعلم رحمك اللّٰه أنّه ينبغي للعبد أن تصحبه الشفقة أبداً ما صحب الدنيا لأَنَّه لا يدري على ما يموت، وبم يُختم له، وعلى ما يلقى اللّٰه عزّ وجلّ، وإن عمل كل عمل من الخير .

وە بزانە ڕەحمەتی اللّٰه ـت لێ بێ کەوا پێویستە هەردەم بەزەیی دڵنەرمی هاوڕێی بەندە بێت تاکو لەدونیادایە، چونکە نازانێت

لەسەر چی دەمرێت، بەچی کۆتایی بەژیانی دێت، لەسەر چی شتێك دەگاتە پەروەردگاری خۆی، هەرچەندە هەموو کارێکی باش ئەنجام بدات .

٩٢ - وينبغي للرجل المسرف على نفسه أن لا يقطع رجاءه من اللّٰه تعالى عند الموت، ويحسن ظنَّه باللّٰه تبارك وتعالى، ويخاف ذنوبه، فإن رحمه الله فبفضلٍ، وإن عذَّبَهُ فبذنبٍ .

وە پێویستە لەسەر کەسی زیادەڕەو لەتاواندا کە ڕجاو تکا لە اللّٰه تعالی نەبڕێت لەکاتی مردندا، وە گومانی باش بە اللّٰه تعالی ببات، وە ترسی تاوانەکەی هەبێ، جا ئەگەر اللّٰه تعالی ڕەحمی پێ کرد ئەوە بەفەزڵی اللّٰه یە وە ئەگەر سزای بدات ئەوا لەسەر تاوانەکانی خۆیەتی.

«مەبەست پێی ئەوەیە: کە ئیماندار لە نێوان ترس و تکادا کۆبکاتەوە لەکارەکانیدا، واتە نابێت تەنیا بترسێت و بێ ئومێد بێت، وە نابێت ئەوەندە تەئمین بێت کە بیر لەسزای اللە ـش نەکاتەوە .

زانایان دەڵێن : لەکاتی تەندرووستیدا لایەنی ترس زاڵ ببێت بەسەرتدا باشترە، وە لەکاتی مردندا لایەنی ڕجا زاڵ ببێت بەسەرتدا باشترە . چونکە لەکاتی ژیاندا دەتوانی کاربکەیت و تەوبە بکەیت بەڵام لەکاتی مردن ناتوانی هیچ شتێك بکەیت بۆیە لایەنی ڕەجا زاڵ ببێت باشترە، هەروەك لەفەرموودەیەکدا هاتووە کە پێغەمبەر دەفەرموێ : لا یموت أحدکم إلا وهو یحسن الظن بالله **«رواه مسلم»** » .

٩٣ - والإيمان بأنَّ اللّٰه تبارك وتعالى أطْلَحَ نَبِيَهُ ﷺ على ما يكون في أُمَتِهِ إلى يوم القيامة .

وە بەباوەڕبوون بەوەی کە اللّٰه تعالى هەموو ئەوەی دێت بەسەر ئوممەتی پێغەمبەرەکەیدا تاکو ڕۆژی قیامەت پیشان پێغەمەرەکەی داوە .

٩٤ - واعلم أنَّ رسولَ اللّٰه ﷺ قال : ((ستفترق أمتي على ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة))، وهي الجماعة . قيل : يا رسول اللّٰه ! مَنْ هم؟ قال : ((ما أنا عليه اليوم وأصحابي)) . وهكذا كان الدين إلى خلافة عمر بن الخطاب، وهكذا كان في زمن عثمان، فلما قُتل عثمان رضي الله عنه جاء الاختلاف والبدع،

وصار الناس أحزاباً وصاروا فرقاً، فمن الناس من ثبت على الحق عند أول التغيير وقال به وعمل به، ودعا الناس إليه .

فكان الأمر مستقيماً حتى كانت الطبقة الرابعة في خلافة بني فلان انقلب الزمان، وتغير الناس جداً، وفشت البدع، وكثر الدعاة إلى غير سبيل الحق والجماعة، ووقعت المحن في ما شيء، لم يتكلم به رسول الله ﷺ ، ولا أصحابه، ودعوا إلى الفرقة ونهى رسول الله ﷺ عن الفرقة وكفر بعضهم بعضاً، وكل دعا إلى رأيه، وإلى تكفير من خالفه فضلَّ الجُهال والرعاع، ومَنْ لا علم له، وأطمعوا الناس في شيء من أمر الدنيا، وخوفوهم عقاب الدنيا، فاتبعهم الخلق على خوف في دنياهم ورغبة في دنياهم، فصارت السنة وأهلها مكتومين، وظهرت البدع وفشت، وكفروا من حيث لا يعلمون من وجوه شتى، ووضعوا القياس، وحملوا قدرة الرب، وآياته، وأحكامه، وأمره، ونهيه على

عقولهم وآرائهم، فما وافق عقولهم قبلوه، وما لم يوافق عقولهم ردوه، فصار الإسلام غريباً، والسنة غريبة، وأهل السنة غرباء في جوف ديارهم .

وە بزانە پێغەمبەری اللّٰە ﷺ فەرموویەتی : «**ئوممەتەکەم دەبێتە حەفتاو سێ تاقم و فیرقەوە، هەمووی لەئاگردایە تەنها یەکێکیان نەبێت ئەویش جەماعەتە.**

**فەرموویان : ئەی پێغەمەری اللە ﷺ کێن ئەو کۆمەڵە رزگاربووە؟ فەرمووی : ئەو ڕێگایەی ئەمڕۆ من و هاوەڵانی لەسەرین**» .

دینەکە بەم شێوەیە بوو تاکو خیلافەتی عومەری کوڕی خطاب رضي الله عنه هەمووی جەماعەیە هەر بەمشێوەیە بوو لەسەردەمی

عثمان رضي الله عنه ، کاتێ عثمان رضي الله عنه کوژرا، ئەوا

جیاوازی و بیدعە هاتە کایەوە، خەڵکی بوونە چەند حیزب و گرووپێکەوە، جا لەخەڵکی هەبوون دامەزراو بوو لەسەر حەق هەر لەیەکەم گۆڕانکارییەوە، بەو قسەوە قسەی دەکرد و کاری پێدەکرد و خەڵکی بۆ بانگ دەکرد .

کارەکە بە ڕاست و ڕێك و پێکی دەڕۆیشت تاکو چینی چوارەم پەیدابوو لە خیلافەتی بەنی فلان و زەمانە هەڵگەڕایەوە، وە خەڵکی زۆر گۆڕان، وە بیدعە بڵاوبۆوە، بانگەوازکاران بۆ ڕێگەی غەیری حەق و جەماعە زۆربوون، لەهەموو شتێکدا تاقیکردنەوە ڕوویدا، کە پێغەمبەری اللّٰه قسەی تێدا نەکردبوو، وە هیچ هاوەڵێکیش قسەیان تێدا نەکردبوو .

بانگەوازیان کرد بۆ جیاوازی و دووبەرەکی لەکاتێك پێغەمبەری اللّٰه نەهی لە دووبەرەکی کردووە، هەندێکیان ئەوانیتری کافر کرد و هەریەکە بانگەشە بۆ بۆچوونی خۆی دەکات و بۆ بەکافر زانینی ئەوانەی ناکۆکن لەگەڵیاندا «**واتە هەریەکەیان کە**

**بانگەشەیان دەکرد بۆ ئەوەبوو کە لای بەرامبەر کە ناکۆك بوون لەگەڵیان بە کافریان بزانن، تا لایەنی خۆی زاڵ بکات بەسەریدا»**، بۆیە نەفامان و خەڵکی عەوام و ئەوانەی علمیان نییە گومڕا بوون، طەماعیان دا بەخەڵکی بەشتی دونیا، بەسزای دونیا ئەوانیان ترساند، بۆیەش خەڵکی شوێنی ئەوان کەوتن لەترسی دونیاکەیان و طەماعی ئەوەی لە دونیاکەیاندا هەیە.

**«واتە بۆیە شوێنی ئەوان دەکەوتن تاکو شتێکیان لە سەروەت و ماڵی دونیا دەست بکەوێت هەرچەندە لەسەر عەقیدەیەکی پووچ و باطل بن»**

جا سوننەت و ئەهلی سوننەت شاراوە بوون و بیدعە دەرکەوت و بڵاوبۆوە، بەشێوەیەك نازانن لەچەند ڕوویەکەوە کوفریان کرد و قیاسیان دانا، توانای پەروەردگار و ئایەتەکانی و ئەحکامەکانی و فەرمانەکانی و نەهییەکانی بە پێی عەقڵ و بۆچوونی خۆیان لێك

دەدایەوە، جا ئەوەی لەگەڵ عەقڵی ئەواندا دەگونجا ئەوا وەریاندەگرت، وە ئەوەی لەگەڵ عەقڵیان نەدەگونجا ڕەددیان دەکردەوە، بۆیە ئیسلام نامۆ بوو، سوننەتیش نامۆ بوو، وە ئەهلی سوننە لەماڵی خۆیاندا نامۆ بوون .

٩٥ - واعلم أَنَّ المُتعةَ مُتعة النساء والاستحلال حرام إلى يوم القيامة .

وە بزانە متعة و حەڵاڵکردنی «**واتە حەڵاڵ کردنی متعة**» حەرامە تاکو ڕۆژی قیامەت .

**«ڕاستە بابەتێکی فیقهییە بەڵام متعة لە هاوسەرگیری پەیوەندی بە عەقیدەوە هەیە چونکە حەڵاڵ کردنی شتێکە کە الله حەڕامی کردووە» .**

٩٦ - واعرف لبني هاشم فضلهم، لقرابتهم من رسول الله ﷺ، وتعرف فضل قريش والعرب، وجميع الأفخاذ، فاعرف قدرهم وحقوقهم في الإسلام، ومولى القوم منهم، وتعرف لسائر الناس حقهم في الإسلام، واعرف فضل الأنصار، ووصية رسول الله ﷺ فيهم، وآل رسول فلا تنساهم، واعرف فضلهم وكراماتهم، وجيرانه من أهل المدينة فاعرف فضلهم .

وە فەزڵی بەنی هاشم بزانە، لەبەر نزیکیان لەپێغەمبەری اللّٰه ـوە، وە فەزڵی قورێش و عەرەب هەموو تیرەکان بزانە، جا قەدرو مافیان بزانە لە ئیسلامدا، وە مەولای هەر قەومێك هەر لە خۆیانە و حەقی هەموو خەڵکی بزانە لە ئیسلامدا .
فەزڵی الانصار بزانە، وە ئامۆژگارییەکەی پێغەمبەری اللّٰه لەواندا بزانە، وە فەزڵی ئالی پێغەمبەری اللّٰه بزانە و هەرگیز جوێنیان پێ

مەدە، وە فەزڵ و کەرامەتیان بزانە، وە دراوسێکانیان لە ئەهلی مەدینەش ئەوانیش فەزڵیان بزانە .

٩٧ - واعلم رحمك اللّٰه أَنَّ أهلَ العلم لم يزالوا يردون قول الجهمية، حتى كان في خلافة بني فلان تكلّم الرويبضة في أمر العامة، وطعنوا على آثار رسول اللّٰه ﷺ ، وأخذوا بالقياس والرأي، وكفروا من خالفهم، فدخل في قولهم الجاهل والمغفل، والذي لا علم له، حتى كفروا من حيث لا يعلمون فهلكت الأمة من وجوه، وكفرت من وجوه، وتزندقت من وجوه، وضلت من وجوه، وتفرقت وابتدعت من وجوه إلَّا من ثبت على قول رسول اللّٰه ﷺ ، وأمره وأمر أصحابه، ولم يخطيء أحداً منهم، ولم يجاوز أمرهم، ووسعه ما وسعهم، ولم يرغب عن طريقتهم ومذهبهم، وعلم أنهم كانوا على الإِسلام الصحيح والإيمان

الصحيح، فقلدهم دينه واستراح، وعَلِمَ أَنَّ الدينَ إنما هو بالتقليد، والتقليد لأصحاب محمد ﷺ .

وە بزانە ئەهلی عیلم بەردەوام ڕەددی قسەی جەهەمییەکان دەداتەوە، تاکو سەردەمی خیلافەتی بەنی عبباسی هات و«**رويبضة**» هاتە زمان لەکاروباری گشتی دا، تانەیان دا لە فەرموودەکانی پێغەمبەری اللّٰه ، و قیاس و بۆچوونیان وەرگرت و ئەوانەی جیاواز بوون لەگەڵیاندا بەکافریان دەزانین .
بۆیە خەڵکی نەفام و بێ ئاگا، وە ئەوانەی علمیان نییە چوونە سەر ڕای ئەوان، تاکو تووشی کوفر بوون بەشێوەیەك ئاگایان لەخۆیان نەبوو، بۆیە ئەم ئومەتە بە هەلاکەتدا چوو، لەچەند ڕوویەکەوە کوفریان کرد، وە لەچەند ڕوویەکەوە زەندیق بوون، لەچەند ڕوویەکەوە گومڕا بوون، جیاواز بوون و بیدعەیان کرد لەچەند ڕوویەکەوە، ئیللا ئەوانە نەبێ کە دامەزراو بوون لەسەر

قسەی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ فەرمانی ئەو و فەرمانی هاوەڵانی، قسەیان پێش هیچ یەکێك لەوان نەخست و لە فەرمانی ئەوان تێنەپەڕین، وە ئەوەی ئەو ووتی هەر ئەوەی بەس بوو، پشتی هەڵنەکرد لە ڕێگا و مەزهەبی ئەوان، وە زانی کەوا ئەوان لەسەر ئیسلام و ئیمانی ڕاست و تەواون، بۆیە لە دینەکەیدا چاوی لەوان کرد و بێ خەم بوو، زانی کەوا دین بریتییە لە چاولێکردن، چاولێکردنی هاوەڵانی محمد .

٩٨ - واعلم أنَّ من قال : لفظي بالقرآن مخلوق فهو مبتدع، ومَنْ سكت فلم يقل مخلوق ولا غير مخلوق فهو جهمي، هكذا قال أحمد بن حنبل .

وقال رسول اللّٰه ﷺ : ((إنه مَنْ يعش منكم بعدي فسيرى اختلافاً كثيراً، فإيَّاكم ومحدثات الأمور فإنها ضلالة، وعليكم

بسنتي، وسنة الخلفاء الراشدين المهديين، وعَضُّوا عليها بالنواجذ)) .

وە هەر کەسێ بڵێت : لەفزم بەقورئان دروستکراوە ئەوە جەهەمییە **«ئەوەی لە دەمی کەسەکەوە دێتە دەرەوە هەر قورئانە قورئانیش درووستکراو نییە»**، هەرکەسێ بێ دەنگ بوو نەیگووت : دروستکراوە یان دروستکراو نیە ئەویش جەهەمییە، ئا بەم شێوەیە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرموویەتی،

پێغەمبەری اللّٰه ﷺ دەفەرموێ : هەرکەس لە ئێوە لەپاش من بژییێت ئەوا جیاوازی و دووبەرەکی زۆر دەبینێت، خۆتان لە داهێنراوەکان بەدوور بگرن، چونکە هەموو بیدعەیەك گومڕاییە، جا ئامۆژگاریتان دەکەم دەست بەسوننەت وڕێگاکەی منەوە بگرن، وە دەست بە سوننەت و ڕێگای جێنشینە ڕێنمونی

کراوەکانەوە بگرن، توند دەستی پێوە بگرن، بە ددانەکانتان توند بیگرن .

٩٩ - واعلم أنَّه إنما جاء هلاك الجهمية : أنهم فكروا في الرب عزّ وجلّ فأدخلوا : لِمَ؟ وكيف؟ وتركوا الأثر، ووضعوا القياس، وقاسوا الدين على رأيهم فجاءوا بالكفر عياناً، لا يخفى إنه كفر، وكفروا الخلق، واضطرهم الأمر حتى قالوا بالتعطيل .

وە بزانە کەوا بەهەلاکەت چوونی جەهەمییەکان بەهۆی ئەوەوە بوو بیریان لە پەروەردگار کردەوە، چەند وشەیەکیان هێنایە ئاراوە وەك : بۆ؟ چۆن؟ وازیان لەفەرموودە هێنا، قیاسیان دانا، قیاسی دینیان بە بۆچوونی خۆیان کرد، بۆیە بەئاشکرایی کوفریان هێنایە کایەوە و ناشاردێتەوە، جا خۆیان کافر بوون و خەڵکیشیان کافر

کرد و کارەکە ناچاری کردن تاکو لەکارخستنیان هێنایە کایەوە «واتە : التعطیل»

**«واتە گومڕایی لەدوای گومڕایی بیان ئەنجامدا تا گەیشتە ئەوەی کە ناو و سیفاتە جوانەکانی الله تعالی پەکبخەن» .**

١٠٠ - وقال بعض العلماء منهم أحمد بن حنبل رضي الله عنه :

الجهمي كافرٌ، ليس من أهل القبلة، حلال الدم، لا يرث، ولا يُورّث لأنه قال : لا جمعة ولا جماعة، ولا عيدين، ولا صدقة وقالوا : من لم يقل القرآن مخلوقاً فهو كافر، واستحلوا السيف على أمة محمد ﷺ ، وخالفوا مَنْ كان قبلهم، وامتحنوا الناس بشيء لم يتكلم فيه رسول اللّٰه ﷺ ولا أحد من أصحابه، وأرادوا تعطيل المساجد والجوامع، وأوهنوا الإسلام، وعطلوا الجهاد

وعملوا في الفرقة، وخالفوا الآثار، وتكلموا بالمنسوخ، واحتجوا بالمتشابه، فشككوا الناس في أرائهم وأديانهم، واختصموا في ربهم، وقالوا : ليس عذاب قبر، ولا حوض، ولا شفاعة، والجنة والنار لم تخلقا، وأنكروا كثيراً مما قال رسول اللّٰه ﷺ ، فاستحل من استحل تكفيرهم ودمائهم من هذا الوجه، لأنه من ردّ آية من كتاب اللّٰه فقد ردّ الكتاب كله، ومن ردّ أثراً عن رسول اللّٰه ﷺ فقد ردّ الأثر كله، وهو كافر باللّٰه العظيم، فدامت لهم المدة، ووجدوا من السلطان معونة على ذلك، ووضعوا السيف، والسوط دون ذلك، فدرس علم السنة والجماعة وأوهنوهما، وصارتا مكتومين لإظهار البدع والكلام فيها، ولكثرتهم، واتخذوا المجالس وأظهروا رأيهم، ووضعوا فيه الكتب، وأطمعوا الناس، وطلبوا لهم الرئاسة، فكانت فتنة عظيمة، لم ينج منها إلا مَنْ عَصَمَ اللّٰه ، فأدنى ما كان يصيب الرجل من مجالستهم أن يشك

في دينه، أو يتابعهم، أو يرى رأيهم على الحق، ولا يدري أنه على الحق أو على الباطل، فصار شاكاً فهلك الخلق حتى كان أيام جعفر الذي يقال له : المتوكل فأطفأ اللّٰه به البدع، وأظهر به الحق، وأظهر به أهل السنة، وطالت ألسنتهم، مع قِلتهم وكثرة أهل البدع إلى يومنا هذا .

والرسم وأعلام الضلالة قد بقي منهم قوم يعملون بها، ويدعون إليها، لا مانع يمنعهم، ولا أحد يحجزهم عمّا يقولون ويعملون!

وە هەندێ لەزانایان لەوانە ئەحمەدی کوڕی حەنبە اللّٰه لێی ڕازی بێت دەڵێت کەسی جەهمی کافرە، ئەهلی قیبلە نییە، خوێنی حەڵاڵە، لەمیرات هیچ وەرناگرێ، وە ماڵەکەی نابێتە میراتی، چونکە ئەو دەڵێت هەر کەسێ نەڵێت : نە جومعە و نە جەماعەت، وە نەدوو جەژن، وە نەصەدەقە هەیە، هەروەها دەڵێن : هەرکەسێ نەڵێت : قورئان دروستکراوە ئەوا کافرە.

شمشێریان لەسەر ئوممەتی محمد ﷺ یان حەڵاڵ کرد، لەگەڵ ئەوانەی پێش خۆیاندا جیاوازبوون، خەڵکیان تاقی دەکردوە لەشتێکدا کە پێغەمبەری اللّٰه ﷺ و هاوەڵانی قسەیان تیادا نەکردووە، ویستیان مزگەوتەکانیان لەکاربخەن .

بوونە هۆی لاوازبونی ئیسلام، جیهادیان لەکارخست کاریان بۆ پارچە پارچەکردنی موسڵمان کرد، لەگەڵ بەڵگە و سوننەتەکاندا جیاوازبوون، بەڵگە منسوخ ەکەیان وەرگرت، وە بەڵگەی متشابهەکان بیان کردە حوجە، بۆیە گومانیان خستە ناو دڵی خەڵکییەوە لە دینەکەیاندا وە لە بۆچوونەکەیاندا، وە دەمبازیان لەزاتی پەروەردگاردا کردو ووتیان : سزای ناوگۆڕ بوونی نیە، وە حەوز و شەفاعەت نییە بەهەشت و دۆزەخ دروست نەکراون، زۆربەی ئەوانەی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ فەرموویەتی ئینکاریان لێ کرد، بۆیە ئەوانەی بەکافریان دەزانن خوێنی ئەوانەیان

حەڵاڵ کرد لەم ڕوویەوە، چونکە هەرکەسێ یەك ئایەت لەقورئان ڕەتبکاتەوە ئەوا هەموو قورئانی ڕەتکردۆتەوە، هەرکەسێ یەك فەرموودە ڕەتبکاتەوە ئەوا هەموو فەرموودەکانی ڕەتکردۆتەوە، ئەویش کافرە بە اللّٰه تعالی .

ماوەیەك ڕۆژگار بۆ ئەوان بوو لەلایەن دەسەڵاتەوە یارمەتی دەریان هەبوو بۆ بڵاوکردنەوی ڕاکەیان، بەشمشێر و قامچی دەجوڵانەوە لەگەڵ ئەو کەسانەی لەگەڵ ڕاو بۆچوونی ئەواندا نەبوون، بۆیە عیلمی سوننە و جەماعە پەرت و بڵاو بووەوە لاوازیان کرد، ئەهلی سوننە و جەماعە شاراوە و نادیار بوون لەبەر دەرکەوتنی بیدعە و کەلام لەمەسەلەکاندا، لەبەر ژمارە زۆرییان و چەندان مەجلیسان داناو بۆچوونی خۆیان دەرخست، وە چەندین کتێبیان لەو بابەتەدا نووسی، طەماعیان خستە بەر خەڵکی و سەرۆکایەتی و دەسەڵاتیان بۆ ئەوان دەویست، بۆیە فیتنەیەکی گەورە بەرپا بوو، هیچ کەسێك لێی دەرباز نەبوو ئیللا ئەوانە نەبێ کە اللّٰه تعالی

پاراستنی، کەمترین شت تووشی پیاوێك دەبوو لە مەجلیسەکانی ئەواندا ئەوە بوو گومانی لەدینەکەیدا بۆ دروست دەبوو، یان شوێنی ئەوان دەکەوت، یان وایدەزانی ڕاو بۆچوونی ئەوان حەقە، وە نەیدەزانی خۆی لەسەر حەقە یان لەسەرباطل ە، بۆیە گومانی بۆ پەیدا بوو، خەڵکی بەهەلاکەتدا چوون تاکو سەردەمی جەعفەر کە پێیان دەگووت «**المتوكل**» « **المتوكل على الله** » ئەمە نازناوەکەیەتی بەڵام ناوەکەی جعفری کوڕی الواثق بوو اللّٰه تعالی بەهۆی ئەوەوە ئاگری بیدعەی کوژاندەوە، وە حەقی دەرخست، وە ئەهلی سوننە بەهۆیەوە دەرکەوتن و زمانیان درێژ بوو هەرچەندە خۆیان کەم بوون و ئەهلی بیدعە زۆربوون تاکو ئەمڕۆ .

میراتگران و ناودارانی گومڕایی مانەوە کۆمەڵێك لەوان مانەوە کاریان پێ دەکرد، بانگەوازی بۆ دەکەن هیچ ڕێگرییەك ڕێگایان لێ ناگرێت، هیچ کەسێك ڕێگریان نییە لەوەی دەیڵێن و دەیکەن .

١٠١ - واعلم أنه لم تجىء بدعة قط إلاَّ من الهمج الرعاع أتباع كل ناعق، يميلون مع كل ريح، فمن كان هكذا فلا دين له، قال اللّٰه تبارك وتعالى : فَمَا اخْتَلَفُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ .

وقال : وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا الَّذِينَ أُوتُوهُ مِن بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ .

وهم علماء السوء أصحاب الطمع والبدع .

وە بزانە هەرگیز زەندەقە پەیدا نەبووە ئیللا لەڕێگەی کەسانی نەزانەوە نەبێت کەشوێن هەموو قسەکەرێ دەکەون، لەگەڵ هەموو بایەکیدا لاردەبنەوە، جا هەرکەسێ وابوو ئەوا دینی نییە، اللّٰه تعالی دەفەرموێت : ناکۆکی و دووبەرەکیان لە نێواندا بەرپا نەبوو مەگەر دوای ئەوەی کە هەموو شت ڕوون بۆوە و زانستیان بۆ هات . وە فەرموویەتی : کەسیش جیاوازی و کێشەی لەسەر

بەرپا نەکرد جگە لەوانەی کە ئەو کتێبانەیان پێ بەخشراوە دوای ئەوەی بەڵگەو نیشانەی ڕوون و ئاشکرایان بۆ هات «**کە قورئانە**». ئەوانیش زانای خراپ وخاونی طەماع و بیدعەن .

١٠٢ - واعلم أنه لا يزال الناس في عصابة من أهل الحق والسنة، يهديهم اللّٰه ، ويهدي بهم غيرهم، ويُحيي بهم السنن، فهم الذين وصفهم اللّٰه تعالى مع قلتهم عند الاختلاف فقال : فَمَا اخْتَلَفُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ .
فاستثناهم فقال : فَهَدَى اللّٰه الَّذِينَ آمَنُوا لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ وَاللّٰه يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ .

وە بزانە کۆمەڵێکی خەڵکی بەردەوام لەسەر ئەهلی حەق و سوننەتن، اللّٰه تعالی ڕێنموییان دەکات، وە اللّٰه تعالی هیدایەتی جگە لەوانیش دەدات بەهۆی ئەوانەوە، وە سوننەتەکان زیندوو

دەکەنەوە، اللّٰه تعالی وصفی ئەوانی کردووە لەکاتی جیاوازیدا هەرچەندە کەمن، دەفەرمویێت : کەسیش جیاوازی و کێشەی لەسەر بەرپا نەکرد جگە لەوانەی کە ئەو کتێبانەیان پێ بەخشراوە دوای ئەوەی بەڵگەو نیشانەی ڕوون و ئاشکرایان بۆ هات«**کە قورئانە**».

اللّٰه تعالی ئەوانی جیاکردوە فەرمووی : اللّٰه هیدایەت و ڕێنمووی ئیماندارانی کرد بۆ دۆزینەوەی حەق و پەیڕەوی کردنی لە نێوان ئەو مەسەلانەی کە ئەوان کێشەیان لە سەری هەبوو و اللّٰه ڕێنموویی هەرکەسێك دەکات کە بیەوێت و «**شایستە بێت**» بۆ ڕێگە و ڕێبازی ڕاست و دروست .

هەروەها پێغەمبەری اللّٰه ﷺ فەرموویەتی : «**بەردەوام کۆمەڵێک هەن لە ئوممەتی من لەسەر حەق ئاشکرا و ڕوونن، هیچ زەرەریان پێ ناگەیێنێت ئەوەی پشتیان لێ**

ئەكات، تاكو فەرمانی الله دێت ڕۆژی قیامەت لەسەر حەقی ئاشكرا و ڕوون دەمێنەوە ».

١٠٣ - واعلم رحمك اللّٰه أنَّ العلمَ ليس بكثرة الرواية والكتب إنما العالم من اتبع العلم والسنن، وإن كان قليل العلم والكتب، ومن خالف الكتاب والسنة فهو صاحب بدعة، وإن كان وإن كان كثير العلم والكتب .

وه بزانه ڕەحمەتی اللّٰه ـت لێ بێت كەوا عیلم بەزۆری كتێب وڕیوایەت نییە، بەڵكو زانا ئەو كەسەیە شوێنی عیلم وسوننەتەكان دەكەوێت، هەرچەندە عیلم وكتێبی كەم بێت، هەر كەسێك لەگەڵ قوڕئان و وسوننەدا ناكۆك بوو ئەوا خاوەنی بیدعەیە هەرچەندە كتێب وعیلمی زۆر بێت .

١٠٤ - واعلم رحمك اللّٰه أنَّ من قال في دين اللّٰه برأيِهِ وقياسِهِ، وتأويلهِ مِنْ غير حُجَةٍ مِنْ السنةِ والجَمَاعَةِ فقد قال على اللّٰه ما لا يَعْلَم . ومن قال على اللّٰه ما لا يعلم فهو من المتكلفين!

وه بزانه ڕەحمەتی اللّٰه ـت لێ بێت هەرکەسێ لەدینی اللّٰه دا به بۆچوون و قیاس و تەئویلی خۆی قسەی کرد بەبێ حوجه لەسوننه و جەماعەدا، ئەوا بەناوی اللّٰه وه قسەی کردووه بەبێ عیلم . وهەرکەسێ بەناوی اللّٰه وه قسه بکات بەبێ عیلم ئەوه یەکێکه له زۆر لەخۆکردووەکان .

« زۆرلەخۆکردووەکان «**المتكلفين**» : ئەوانەن قسە لەدیندا دەکەن بەبێ بەڵگە».

١٠٥ - والحق ما جاء من عند اللّٰه عز وجل، والسُّنَّةُ: سُنَّةُ رسول اللّٰه ﷺ ، والجماعة : ما اجتمع عليه أصحاب رسول اللّٰه ﷺ في خلافة أبي بكر وعمر وعثمان .

وە حەقیش ئەوەیە لەلایەن اللّٰە وە عزوجل هاتبێ، وە سوننەتیش : سوننەتی پێغەمبەری اللّٰە ﷺ ، جەماعە : ئەوەیە کە هاوەڵانی پێغەمبەری اللّٰە ﷺ لەسەری کۆکبوون لەخیلافەتی ئەبو بەکر و عومەر و عثماندا رضي الله عنهم اجمعین .

١٠٦ - ومَنْ اقتصر على سُنَّةِ رسول اللّٰه ﷺ وما كان عليه أصحابه و الجماعة فَلَجَ على أهل البدعة كلهم، واستراح بدنه،

وسلم له دينه إن شاء اللّٰه لأنَّ رسول اللّٰه ﷺ قال : ستفترق أمتي وبَيِّنَ لنا رسولُ اللّٰه ﷺ النَّاجي منها فقال : ما كنت أنا عليه اليوم وأصحابي، فهذا هو الشفاء والبيان، والأمر الواضح، والمنار المستنير، وقال رسول اللّٰه ﷺ : إيّاكم والتعمق، وإيّاكم والتنطع، وعليكم بدينكم العتيق .

وە هەرکەسێ دەستی گرت بەسوننەتی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ وە ئەوەی هاوەڵان و جەماعەت لەسەری بوون، ئەوا زاڵ دەبێتە سەر هەموو ئەهلی بیدعەدا، جەستەی ئاسوودە دەبێ، وە دینەکەی سەلامەت دەبێ إن شاء اللّٰه ، چونکە پێغەمبەری اللّٰه ﷺ فەرموویەتی : **«ئوممەتەکەم جیاواز و ناکۆك دەبن»**.

پێغەمبەری اللّٰه ﷺ کۆمەڵە ڕزگاربووەکەی بۆ ڕوون کردووینەتەوە فەرمووی : «**ئەوەی ئەمڕۆ من و هاوەڵانمی لەسەرە**» جا ئەمە چارەسەر و ڕوونکردنەوە و کارە ڕۆشنەکە و مەنارە ڕوناکەکەیە، پێغەمبەری اللّٰه ﷺ دەفەرموێ : خۆتان بپارێزن لە زیادەڕۆیی، وە خۆتان بپارێزن لە توندڕەوی، وە دەست بگرن بەدینی قەدیم .

« **العتيق** : بەمانای قەدیم دێت، واتە مەنهەجی سەلەف، پێغەمبەر و خەلیفەکانی ڕاشدین ڕەزای الله ییان لێبێت.

تێبینیەك ئەم وتەیە هی عبدالله ی بن مسعود ـە رضي الله عنهما نەك پێغەمبەر ﷺ ».

١٠٧ - واعلم أنَّ الدّينَ العتيق : ما كان من وفاة رسول الله ﷺ إلى قتل عثمان بن عفان رضي الله عنه وكان قتله أول الفرقة، وأول الاختلاف، فتحاربت الأمة، وتفرقت، واتبعت الطمع والأهواء، والميل إلى الدنيا، فليس لأحد رخصة في شيء أحدثه مما لم يكن عليه أصحاب رسول الله ﷺ ، أويكون رجل يدعو إلى شيء أحدثه مَنْ قَبله من أهل البدع، فهو كمن أحدثه، فمن زعم ذلك أو قال به فقد رد السنة وخالف الحق و الجماعة، وأباح البدع، وهو أضر على هذه الأمة من إبليس .

وه بزانه دینی قەدیم «العتیق» : ئەو دینەیە پێغەمبەری اللّٰه ﷺ لەسەری وەفاتی کرد، تاکو کوشتنی عوسمانی کوڕی عەفان رضي الله عنه کوشتنی ئەو یەکەم دووبەرەکی وە یەکەم

جیاوازی بوو، جا ئەم ئوممەتە جەنگیان بەرپاکرد، وە لەگەڵ یەکتردا جیاوازی بوون، وە شوێنی طەماع وهەوا و ئارەزوو کەوتن، وە لادان بەرەو لای دونیا، جا هیچ کەسێك ئیزنی پێ نەدراوە لەهەرشتێکدا دایهێنابێ لەوەی هاوەڵانی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ لەسەری نەبوون، یان بانگەواز بۆ داهێنراوێك بکات لەپێش خۆی دایهێنابێ لەبیدعەکاران، ئەوە وەکو ئەو کەسەیە کە خۆی دایهێنابێ، هەرکەسێك باوەڕی وابێت یان ئەوە بڵێت «**واتە هەمان قسەی بیدعەکاران بکات**»، ئەوا سوننەتی ڕەتکردۆتەوە و پێچەوانەی حەق و جەماعەیە، وە بیدعەی حەڵاڵ کردووە، ئەو کەسەش زیانبەخشترە لەسەر ئەم ئومەتە لە ئیبلیس .

١٠٨ - ومَنْ عَرَفَ ما تركَ أصحابُ البدعِ من السنَّة، وما فارقوا فيه فتمسك به فهو صاحب سنة وصاحب جماعة، وحقيق أنْ

يُتَبعَ وأنْ يُعَانَ وأنْ يُحْفَظَ، وهو ممن أوصى به رسول اللّٰه ﷺ .

هەرکەسێ بزانێ کە بیدعەکاران وازیان لە چ سوننەتێك هێناوە، وە ئەوەی لێی جیابونەتەوە، ئەو دەستی پێوە بگرێ ئەوە ئەو کەسە أهلی سوننە و جماعەیە، حەقی خۆیەتی شوێنی بکەون، وە یارمەتی بدرێت، وە بپارێزرێت، وە ئەویش هەر ئەوەیە پێغەمبەری اللّٰه ﷺ وەسیەتی بۆ کردوون .

١٠٩- واعلموا رحمكم اللّٰه أن أصول البدع أربعة أيواب : انشعب من هذه الأربعة إثنان وسبعون هوى، ثم يصير كل واحد من البدع يشعب، حتى تصير كلها إلى ألفين وثمان ماثة قالَة وكلها ضلالة، وكلها فى النار إلاَّ واحدة .

وهو من آمن بما فی هذا الكتاب، واعتقده من غير ريبة في قلبه ولا شكوك فهو صاحب سنة، وهو الناجي إن شاء اللّٰه .

وە بزانە ڕەحمەتی اللّٰه ـت لێ بێت بناغەی بیدعەکاران چوار بنەمایە : لەم چوارەوە حەفتاو دوو ئارەزووی لێ دەبێتەوە، ئینجا هەریەکێك لەوانە دەبێتە چەند لقێکەوە، تاکو هەر هەمووی دەگاتە دوو هەزارو هەشت سەد، هەر هەمووی گومڕایی یە، هەر هەمووی لەئاگردان، تەنها یەکێکیان نەبێ .
ئەویش ئەو کۆمەڵەن باوەڕیان هەیە بەوەی لەم کتێبەدا هەیە، باوەڕی پێ هەبێ بەبێ هیچ گومانێك لە دڵیدا، ئەوە کەسێکی سوونیە، هەر ئەویش دەربازی دەبێ إن شاء اللّٰه .

١١٠ - واعلم رحمك اللّٰه لو أَنَّ الناس وقفوا عند محدثات الأمور، ولم يتجاوزوها بشيء، ولم يولدوا كلاماً مما لم يجيء فيه أثر عن رسول اللّٰه ﷺ ولا عن أصحابه لم تكن بدعة .

وە بزانە ڕەحمەتی اللّٰه ـت لێ بێت ئەگەر خەڵکی لەسەر شتە داهێنراوەکان وەستان، وە بەسەریدا تێنەپەڕین، هیچ قسەیەکیان دروست نەکرد بەوەی هیچ ئەثەرێك لە پێغەمبەری اللّٰه ﷺ وە نەهاتبێت، وە لە هاوەڵانەوەش نەهاتبێت، ئەوا بیدعە دروست نەدەبوو.

**«واتە ئەگەر إنسان لێی وەستا و نەچووە ناو ئەو باسانەو تەنیا خەریکی سوننە بوو، زیاد لەوە لێی دەرنەچوو، ئەوا دەربازی دەبوو لە بیدعە، بەڵام گەر کەسێك لە سوننە تێپەڕێ و لەخۆیەوە شت دابهێنێت**

ئەوا لەگەڵ بیدعەکاران دەبێت، لەگەڵ کۆمەڵە گومڕاکان . الله پەمانا بدات» .

١١١ - واعلم رحمك اللّٰه أنَّه ليس بين العبد وبين أن يكون مؤمناً حتى يصير كافراً إلا أن يجحد شيئاً مما أنزله اللّٰه تعالى، أو يزيد في كلام اللّٰه ، أو ينقص، أوينكر شيئاً مما قال اللّٰه عزّ وجلّ أوشيئاً مما تكلم به رسول اللّٰه ﷺ .

فائق اللّٰه رحمك اللّٰه وانظر لنفسك، وإياك والغلو في الدين، فإنه ليس طريق الحق في شيئا ً.

وە بزانە ڕەحمەتی اللّٰه ـت لێ بێت هیچ شتێك لەنێوان بەندە و ئەوەی ببێتە ئیماندار دا نییە تاکو دەبێتە کافر ئیللا نکۆڵی لە شتێك بکات کە اللّٰه تعالی دایبەزاندبێت، یان قسەکانی اللّٰه تعالی زیادبکات، یان کەمی بکاتەوە، یان ئینکاری

لەشتێك بكات كە اللّٰه وتبێتی، یان پێغەمبەری اللّٰه ﷺ وتبێتی.
جا لەاللّٰه بترسە ڕەحمەتی اللّٰه ـت لێ بێت تەماشای خۆت بكە، وە ئاگاداری زیادەڕۆیی بە لە دیندا، چونكە ئەوە بەهیچ شێوەیەك ڕێگای حەق نییە .

١١٢ - وجميع ما وصفت لك في هذا الكتاب فهو عن اللّٰه تعالى، وعن رسول اللّٰه ﷺ وعن أصحابه. وعن التابعين وعن القرن الثالث إلى القرن الرابع .

هەموو ئەوەی لەم كتێبەدا وەصفم بۆت كردووە هەموو ئەوانە لە اللّٰه تعالى، وە لە پێغەمبەری اللّٰه ﷺ ، وە لە هاوەڵا و شوێنكەوتوان و لەسەدە سێیەم تا سەدەی چوارەم هاتووە .

لە اللّٰە بترسە ئەی بەندەی اللّٰە ، پێویستە لەسەرت بەڕاست زانین و تەسلیم بوون و تفویض و ڕازی بوون لەوەی لەم کتێبەدا هەیە، ئەم کتێبە لە هیچ کەسێکی ئەهلی قیبلە مەشارەوە بەڵکو سەرلێ شێواوێك لە سەرلێ شێواویەکەی بگەڕێتەوە، یان خاوەن بیدعەیەك لە بیدعەکەی، یان گومڕایەك لە گومڕاییەکەی و پێی دەرباز ببێت .

لە اللّٰە بترسە، پێویستە لەسەرت دەست بە کارە یەکەمە قەدیمەکە بگریت، ئەویش ئەوەیە لەم کتێبەدا وەصفم بۆت کردووە، ڕەحمەتی اللّٰە لەو بەندەیە، وە ڕەحمەتی اللّٰە لەدایك و باوکی ئەوەی ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە، وە بڵاوی دەکاتەوە و کاری پێدەکات و بانگەوازی بۆ دەکات و بیکاتە بەڵگەی خۆی، چونکە ئەوە دینی اللّٰە و دینی پێغەمبەری اللّٰە ییە ﷺ .

هەرکەسێ شتێك حەڵاڵ بکات جیاواز بێت لەوەی لەم کتێبەدا هەیە، ئەوا بە هیچ دینێك دینداری نەکردووە، هەمووی ڕەتکردۆتەوە، هەروەکو ئەوەی کەسێك باوەڕی بەهەموو ئەوەی اللّٰه تعالی فەرموویەتی هەیە تەنیا لە یەك پیتدا گومانی هەیە ئەوا هەموو ئەوەی اللّٰه تعالی فەرموویەتی ڕەتیکردۆتەوە، ئەویش کافرە، هەروەکو شایەتیدانی لاإله إلااللّٰه لە خاوەنەکەی وەرناگیرێ، ئیللا بە ڕاستگۆیی و نیەت و یەقینێکی دڵسۆزی نەبێت، بەهەمان شێوە اللّٰه تعالی هیچ لە سوننەتەوە وەرناگرێ بە وازهێنان لەهەندێکی، هەرکەسێ وازی لە بەشێکی سوننە هێنا، ئەوا وازی لەهەموو سوننە هێناوە، لەسەرتە قبوڵی بکەیت، واز لە وتە وت و یاخیبوون بێنیت، چونکە ئەوە بەهیچ شێویەك لەدینی اللّٰه نییە، بەتایبەتی سەردەمەکەی تۆ، سەردەمێکی خراپە بۆیە لە اللّٰه بترسە .

١١٣ - وإذا وقعت الفتنة : فالزم جوف بيتك، وفر من جوار الفتنة، وإياك والعصبية، وكل ما كان من قتال بين المسلمين على الدنيا : فهو فتنة، فاتق اللّٰه وحده لا شريك له، ولا تخرج فيها، ولا تقاتل فيها، ولا تهوى ولا تشايع ولا تُمايل، ولا تحب شيئاً من أمورهم، فإنه يُقَال : مَنْ أحب فعال قوم خيراً كان أو شراً كان كمن عمله . وفقنا اللّٰه وإياكم لمرضاته، وجنبنا وإيَّاكُم معصيته .

ئەگەر فیتنە ڕوویدا ئەوا دەست بە ناو ماڵەکەی خۆتەوە بگرە، لە دراوسێتی فیتنە دوور بکەوە، ئاگادار و وریایی دەمارگیری بە، هەر کوشتارێك لەنێوان موسڵماناندا لەسەر دونیا ڕوویداوە ئەوا فیتنەیە، بۆیە لەخوایە بترسە کە تاك وتەنهایە هیچ هاوبەشێکی نییە، تێیدایە دەرمەچۆ، کوشتاریش مەکە، ئارەزووت بۆلای کەس نەڕوات و لەگەڵ هیچ پارچەیەکدا مەبەو لامەدە، هیچ شتێك

لەکاروباری ئەوانت لا خۆشەویست نەبێ، چونکە گوتراوە هەرکەسێك کردەوی کۆمەڵێکی خۆش بوێت جا ئەگەر چاك بوو یان خراپ بوو ئەوا وەکو ئەو کەسەیە کاری پێ کردبێت، اللّٰه تعالی ئێمە و ئێوەش تەوفیق بدات بۆ ڕەزامەندی خۆی دوورمان بکاتەوە لەسەرپێچی کردنی .

١١٤ - وأَقِلَّ مِنْ النَّظَرِ في النّجومِ إلاَّ ما تستعين به على مواقيت الصلاة، واله عما سوى ذٰلك : فإنَّه يُدعوا إلى الزَنْدَقَةِ .

بەکەمی تەماشای ئەستێرەکان بکە «**ئەستێرە ناسی**»، ئیللا ئەوە نەبێ پشتی پێ ببەستی بۆ زانینی نوێژەکان، جگە لەوە وازی لێ بهێنە چونکە ئەوە بەرەو زەندیقی دەتبات .

«واتە نابێت بۆ ئەو مەبەستە سەیری بکەیت کە دەرکەوتنی فلان ئەستێرە مایەی خۆشبەختیە یان غەم و خەفەتە ئەمە کوفرە پەنا بە الله تعالی» .

١١٥ - وإيّاك والنظر في الكلام، والجلوس إلي أصحاب الكلام .

وریابە و دوور بکەوە لەتەماشاکردنی عیلمی کەلام، وە دانیشتن لەگەڵ ئەهلی کەلام .

١١٦ - وعليك بالآثار وأهل الآثار، وإيَّاهُم فاسأل، ومعهم فاجلس، ومنهم فاقتبس .

وە دەست بگرە بە فەرموودە و ئەهلی فەرموودە، وە پرسیار لەوان بکە، وە لەگەڵ ئەواندا دانیشە، وە لەوانەوە وەرگرە .

١١٧ - واعلم أنَّه ما عُبِدَ اللّٰه بمثل الخوف من اللّٰه : وطريق الخوف والحزن والشفقات والحياء من اللّٰه تبارك وتعالى .

وە بزانە اللّٰه تعالی نەپەرستراوە بەشتێك وەكو ترس لە اللّٰه تعالی ،ڕێگای ترس و خەم و بەزەیی و حەیا لە اللّٰه تعالی وەیە .

«پەرستن ئەبێت سێ شتی لێ كۆبێتەوە :

**ترس**

**تكا و ڕەجا**

**خۆشەویستی**

نابێت تەنیا بە ترسەوە بیپەرستی و لە رەحمی ئەو بێ ئومێد بیت و تكای لێ نەكەیت، وە نابێت تەنیا بەخۆشەویستیەوە بیپەرستی و سزای ئەوت بیربچێ» .

١١٨ - واحذر أن تجلس مع مَنْ يدعو إلي الشَّوق والمحبةِ، ومَنْ يَخْلُو مع النساءِ وطريق المذهب، فإن هٰؤلاء كلهم على الضلالة.

وه ئاگاداربە لەوەی دابنیشی لەگەڵ ئەوانەی بانگەواز بۆ تامەزرۆیی و خۆشەویستی دەکەن «**مەبەستی بە صۆفییەکانە کە شت دادەهێنن لە دیندا و واز لە سوننەت دێنن**»، وە لەگەڵ ئەوانە لەگەڵ ئافرەتاندا دوو بەدوو دەبنەوە و ڕێگای ئەو مەزهەبە، چونکە هەموو ئەوانەی لەسەر گومڕایین . «**چونکە هەندێ لە صۆفییەکان خۆیان ناپارێزن لە حەرام بەبیانوی ئەوەی ئەوان هیچیان لەسەر نییە**» .

١١٩ - واعلم رحمك اللّٰه أنَّ اللّٰه تبارك وتعالى دعا الخلقَ كلهم إلى عبادته، ومَنَّ مِنْ بعدِ ذٰلك علي مَنْ يشاء بالإسلام تَفَضُّلاً .

وە بزانە ڕەحمەتی اللّٰە ـت لێ بێت اللّٰە تعالی بانگی هەموو خەڵکی کردووە بۆ پەرستنی خۆی، وە لەپاش ئەوە منەتی خۆی ڕژاندووە بەسەر ئەو کەسەی ویستی لێ بێت بە ئیسلام بەفەزڵ و منەتی خۆی .

**«واتە هەرکەسێکی بیەوێت بەویستی خۆی و بەفەزڵی خۆی هیدایەتی ئەدات بۆ ئیسلام، بەڵام دەبێت بزانین هیدایەتیش هۆکاری خۆی هەیە، وەکو چۆن بۆ پەیدابوونی ڕزق دەبێ بەدوای هۆکار بگەڕێیت» .**

١٢٠ - والكَفَّ عن حرب عليٍّ ومعاويةَ، وعائشة وطلحةَ والزبير رحمهم اللّٰه أجمعين ومَنْ كان معهم، ولا تخاصم فيهم وكِلْ أمرَهُم إلي اللّٰه تبارك وتعالى، فإن رسول اللّٰه صل اللّٰه عليه وسلم قال : إيَّاكم وذكر أصحابي وأصطاري وأختاني .

وە وازهێنان لەباس کردنی جەنگی نێوان عەلی و مەعاویە و عائیشە و تەڵحە و زوبێر ڕەحمەتی اللّٰه لەهەموویان بێت هەموو ئەوانەی کە لەگەڵیاندا بوون، وە مشت ومڕ مەکە لەواندا کارو باسەکەیان بگەڕێنەوە بۆلای اللّٰه تبارك تعالی، چونکە پێغەمبەری اللّٰه ﷺ فەرموویەتی : ئاگادار بن باسی هاوەڵانی من و زاواکانم بکەن بە خراپە .

وە فەرموویەتی : اللّٰه تبارك وتعالی سەیری ئەهلی بەدری کرد فەرمووی : هەرچی دەتانەوێت بیکەن ئەوا بیکەن من لێتان خۆشبوومە .

١٢١ - واعلم رحمك اللّٰه أَنَّه لا يحل مال امرىء مسلم : إلا بطيبة من نفسه، وإن كان مع رجل مال حرامٌ فقد ضمنه، لا يحل لأحد أن يأخذ منه شيئاً : إلاَّ بإذنه، فإنه عسى أن يتوب هٰذا فيريد أن يرده على أربابه، فأخذت حراماً.

وە بزانە ڕەحمەتی اللّٰە ـت لێ بێت ماڵی هیچ موسڵمانێك حەڵاڵ نییە، ئیللا بە ڕازیبوونی خۆی نەبێ، ئەگەر پارەیەکی حەرام لای کەسێك بوو ئەوا زەمانەتی کردووە «**واتە گەر کەسێك ماڵی براکەی بە ناحەق برد ئەوا لەسەریەتی بیپارێزێت تاکو دەیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی پێش مردن، ئەگینا لە ڕۆژی قیامەت حەسانەتەکان بۆ خاوەن ماڵەکە دەچێت، ئەو کەسەی بردوویەتی ڕەنگە یەك چاکەشی نەمێنێ**»، بۆ هیچ کەسێك حەڵاڵ نییە هیچ شتێکی لێ ببات ئیللا بە ئیزنی ئەو نەبێ، چونکە ڕەنگە ئەو تەوبە بکات و بیەوێ ماڵەکەی بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە، ئەوکاتە تۆ حەرامێکت بردووە .

١٢٢ - والمكاسب مطلقة ما بَانَ لك صحته : فهو مطلق، إلاَّ ما ظهر فسادَه، وإن كان فاسداً يأخذ من الفساد ممسكة نفسه،

ولا تقول : أَتركُ المَكَاسِبَ وآخُذُ ما أعطوني، لم يفعل هٰذا الصحابة ولا العلماء إلى زماننا هٰذا : وقال عمر بن الخطاب رضي الله عنه : كَسْبُ فيه بَعْضُ الدَّنِيَةِ خيرٌ مِنْ الحَاجةِ إلى النَّاسِ.

وه کەسابەتەکان ئەوەی بۆت ڕوون بۆتەوە لەدروستیەتی ئەوە ڕەهایە «مطلقة»، ئیللا ئەوە نەبێ فەسادەکەی دەرکەوتووە، ئەگەر خراپ بوو ئەوەندە لەخراپەکە دەبات تەنها بۆ مانەوەی خۆی، مەڵێ : واز لەکەسابەت دەهێنم ئەوە دەبەم کە پێمی دەدەن **«واتە چاوت لەدەستی خەڵك بێت کە شتێکت پێ بدەن»**، ئەمە هاوەڵان نەیانکردووە، وە زانایان تاکو ئەم سەردەمە نەیانکردووە. عومەری کوڕی خطاب رضي الله عنه فەرموویەتی : کەسابەتێك کەمێك سووکی نزمی تێدا بێت چاکترە لەپێویستی دەستی خەڵکی .

١٢٣ - والصلوات الخمس جائزة خلف مَنْ صليتَ خلفه إلاَّ أن يكون جهمياً فإنه معطل وإن صليت خلفه فأَعِد صلاتكَ، وإن كان إمَامُكَ يوم الجمعة جهمياً وهو سلطان فصلِّ خَلْفَه : وأعد صلاتك، وإن كان إمَامُكَ من السلطان وغيره صَاحِبَ سُنَّةٍ فَصَلِّ خلفه ولا تعد صلاتك .

وە پێنج نوێژەکە دروستە لەپشتی هەرکەسێکەوە بیکەیت ئیللا جەهمی نەبێت چونکە ئەو پەکخەرە «**معطلة**» یە جا ئەگەر نوێژت لەپشتییەوە کرد ئەوا نوێژەکەت دووبارە بکەرەوە، ئەگەر پێشنوێژەکەت جەهمی بوو لەکاتێکدا ئەو دەسەڵاتدار بوو ئەوا نوێژ لەپشتەوە بکە، وە نوێژەکەت دووبارە بکەرەوە، ئەگەر پێشنوێژەکەت دەسەڵاتداربوو یان جگە لەو خاوەنی سوننە بوو ئەوا نوێژ لەپشتییەوە بکە، وە نوێژەکەت دووبارە مەکەرەوە .

١٢٤ - والإيمانُ بأنَّ أبا بكر وعمر رحمهما الله في حجرة عائشة مع رسول اللّٰه صل اللّٰه عليه وسلم، قد هناك معه، فأذا أتيتَ القبرَ فالتسليم عليهما واجب بعد رسول اللّٰه صل اللّٰه عليه وسلم .

وە باوەڕبوون بەوەی ئەبوبەکر و عومەر ڕەحمەتی اللّٰه یان لێبێت لەژوورەکەی عائیشە رضي الله عنها دان لەگەڵ پێغەمبەری اللّٰه صلى الله عليه وسلم ، لەوێ نێژراون، جا ئەگەر چوویت بۆ لای قەبرەکە ئەوە سەلام کردن لەهەردووکیان لەپاش پێغەمبەری اللّٰه صلى الله عليه وسلم واجبە .

١٢٥ - والأمر بالمعروف، والنهي عن المنكر واجبٌ إلا من خِفت سيفَهُ أو عصاهُ .

وە فەرمان کردن بەچاکە، وە نەهی کردن لەخراپە واجبە ئیللا بەرامبەر ئەو کەسە نەبێت کە لە شمشێرەکەی یان لەعەصاکەی بترسیت .

١٢٦ - والتسليم على عباد اللّٰه أجمعين .

وە سەلام کردن لەهەمووی بەندەکانی اللّٰە .

**«بڵاوکردنەوەی سەلام پاداشتی خۆی هەیە وە خۆشەویستی لە دڵەکان دەڕوێنێ، بۆیە کە بە مسوڵمانێك گەیشتی سەلامی لێ بکە» .**

١٢٧ - ومَنْ ترك صلاة الجمعة والجماعة في المسجد من غير عذر، والعذر : كمرض لا طاقة له بالخروج إلى المسجد، أو خوف من السلطان ظالم، وما سوى ذٰلك فلا عذر له .

هەرکەسێك واز لەنوێژی جومعە جەماعەت بهێنێ لەمزگەوت بەبێ هیچ بیانوویەك ئەوە بیدعەچییە .

بیانوش «**العذر**» : وەك نەخۆشیەك کە نەتوانێ دەرچێت بۆ مزگەوت، یان ترسان لە دەسەڵاتدارێکی ستەمکار، جگە لەوانە ئەوا هیچ بیانوێیکی نییە .

١٢٨ - ومن صلى خلف إمام فلم يقتد به فلا صلاة له .

وە هەرکەسێ لە پشت پێشنوێژێکەوە نوێژی کرد و ئیقتدای پێوە نەکرد ئەوا نوێژەکەی دروست نییە .

**«وەکو گومڕاکان لەگەڵ مسوڵمانانـدا نوێژ ناکەن، گەر بیشیکەن نیەتی بەتەنها دێنن، نەك لەگەڵ إمام».**

١٢٩ - والأمر بالمعروف والنهي عن المنكر باليد واللسان والقلب بلا سيف .

وە فەرمان کردن بەچاکە و نەهی کردن لەخراپە بەدەست و زمان ودڵ نەك بە شمشێر .

**«ئەمە ڕەددێکە بۆ خەواریج کە دژی سوڵتان دەوەستنەوە، نابێت بەرامبەر سوڵتانی مسوڵمان چەك هەڵگریت، بڵێیت : ئەمە بەشێکە لە فەرمان کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە» .**

١٣٠ - والمستور من المسلمين من لم تظهر له ريبة .

کەسی ئابڕوودار لە موسڵمانان ئەو کەسەیە کە هیچ گومانی تاوانی ئاشکرای لێ دەرنەکەوتوە .

«واتە إنسانی مسوڵمان نابێت گومانی خراپ بە برا مسوڵمانەکەی ببات، وە ئامۆژگاریکار بیت لەوکاتەی هەڵەی کرد» .

١٣١ - وكل علم إدعاه العباد من علم الباطن لم يوجد في الكتاب وفي السنة : فهو بدعة وضلالة ولا ينبغي لأحد أن يعمل له، ولا يدعو إليه .

هەر علمێك بەندەكان بانگەشەی بۆ دەكەن لەعیلمی «باطن» له كیتاب وسوننەدا نەبێ ئەوە بیدعه و گومڕاییه، وه بۆ هیچ كەسێك نابێ كاری پێ بكات و بانگەوازی بۆ بكات .

١٣٢ - وأيما امرأة وهبت نفسها لرجل، فإنه لا تَحِلَّ له، يعاقبان إن نال منها شيئاً إلاَّ بولي وشاهدي عدل وصَداق .

وە هەرکاتێ ئافرەتێك خۆی پێشکەش بەپیاوێک کرد ئەوا بۆی حەڵاڵ نییە، هەردووکیان سزا دەدرێن ئەگەر هەرکارێك بکەن، ئیللا بەبوونی خاوەنەکەی و دوو شایەتی عەدل و مارەیی نەبێ .

١٣٣ - وإذا رأيت الرجل يطعن على أحد من أصحاب رسول الله ﷺ : فاعلم أنه صاحب قول سوء وهوى، ولقول رسول الله ﷺ : إذا ذكر أصحابي فأمسكوا، فقد علم النبي ﷺ ما يكون منهم من الزلل بعد موته، فلم يقل فيهم إلاَّ خيراً وقوله : ذروا أصحابي، لا تقولوا فيهم إلاَّ خيراً، ولا تحدث بشيء من زللهم ولا حر بهم، ولا ما غاب عنك علمه، ولا تسمعه من أحد يحدث به، فإنه لا يسلم لك قلبك إن سمعت .

وە ئەگەر کەسێکت بینی تانەی لەیەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ دەدا ئەوا بزانە کە خاوەنی قسەی خراپ و هەوا و ئارەزووە، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ کە دەفەرموێت : ئەگەر باسی هاوەڵانم کرا ئەوا دەست هەڵگرن، چونکە پێغەمبەری اللّٰه ﷺ دەیزانی لەپاش مردنی ئەو تووشی هەڵەدەبن، بۆیە لەچاکە زیاتر دەربارەیان هیچی نەگوتوە، وە دەفەرموێت : واز لە هاوەڵانم بێنن، دەربارەیان هیچ قسەیەك مەکەن جگە لە خێر و چاکە. دەربارەی هەڵەکان هیچ مەگێڕەوە، وە دەربارەی جەنگەکانیان و ئەوەی کە زانینی لەتۆوە نادیارە، گوێ لەهیچ کەسێك مەگرە باسی دەکات، چونکە دڵت هەرگیز سەلامەت نابێ ئەگەر تۆ ئەوەت بیست .

١٣٤ - وإذا سمعت الرجل يطعن على الآثار، أو يردّ الآثار، أو يريد غير الآثار، فاتهمه على الإسلام، ولا تشك أنه صاحب هوى مبتدع .

وە ئەگەر کەسێکت بینی تانە لە ئەثەر دەدات یان ئەثەر ڕەتدەکاتەوە، یان جگە لە ئەثەری دەوێت، ئەوا تۆمەتباری بکە لەسەر ئیسلام، گومانت نەبێ ئەوە خاوەنی ئارەزووە بیدعەچیە .

١٣٥ - واعلم أنَّ جَوْرَ الساطانِ لا ينقص فريضة من فرائض اللّٰه عزَّ وجلّ التي افتراضها على لسان نبيه ﷺ ، جوره على نفسه، وتطوعك، وبرك معه تامّ لك إن شاء اللّٰه تعالى : يعني : الجماعة والجمعة معهم، والجهاد معهم، وكل شيء من الطاعات فشاركه فيه فلك نيتك .

وه بزانه ستەمی سوڵتان هەرگیز فەرزێك لەفەرزەكانی اللّٰه كەم ناكاتەوه كه له سەر زاری پێغەمەرەكەی ﷺ فەرزی كردووه، ستەم كردن لەنەفسی خۆیەتی، وه چاكەی تۆ لەگەڵ ئەودا تەواوه إن شاء اللّٰه تعالى، واته جەماعەت و جومعه و جیهادكردن لەگەڵ ئەودا، هەموو شتێك لەگوێڕایەڵییەكان بەشدارییان لەگەڵدا بكه و ئەوا بەپێی نیەتەكەت بۆت دەنوسرێت .

١٣٦ - وإذا رأيت الرجل يدعوا على السلطان : فاعلم أنَّه صاحب هوى، وإذا رأيتَ الرجلَ يدعو للسلطانِ بالصلاحِ: فاعلم أنَّهُ صاحبُ سنَّةٍ، إن شاء اللّٰه .
يقول فضيل بن عياض : لو كانت لي دعوة ما جعلتها إلاَّ في السلطان .

أنا أحمد بن كامل قال : حدثنا الحسين بن محمد الطبري، نا مردويه الصائغ قال : سمعت فضيلاً يقول : لو أنّ لي دعوة مستجابة كا جعلتها إلاَّ في السلطان .

قيل له : أبا علي فَسِّر لنا هذا قال : إذا جعلتها في نفسي لم تَعْدُني، وإذا جعلتها في السلطان صلح: فصلح بصلاحه العباد والبلاد .

فأُمِرْنا أن ندعوا لهم بالصلاح، ولم نؤمر أن ندعوا عليهم، وإن ظلموا وإن جاروا : لأَنَّ ظلمهم وجورهم على أنفسهم، وصلاحهم لأنفسهم وللمسلمين .

معه .

ورأى يونس بن عبيد ابنه وقد خرج من عند صاحب هوى، فقال : يا بني من أين جئتَ؟ قال : من عند فلان، قال : يا بنى لأن أراك خرجت من بيت خُنْثَى، أحبّ إليّ من أن أراك تخرج من

بيت فلان وفلان : ولأن تلقى اللّٰه يا بني زانيا فاسقاً سارقاً خائناً، أحب إليّ من أن تلقاه بقول فلان وفلان .
ألا ترى أن يونس بن عبيد قد علم أن الخُنْثى لا يضِل ابنه عن دينه، وأنَّ صاحِبَ البدعةِ يُضِلَّه حتى يكفر؟! .

وە ئەگەر کابرایەکت بینی دوعای لەسوڵتان دەکرد بزانە ئەوە خاوەن ئارەزووە، بەڵام ئەگەر کەسێکت بینی دوعای بۆ سوڵتان دەکات بەچاکسازی ئەوا بزانە خاوەنی سوننەتە ان شاء اللّٰه .
فضیل ی کوڕی عیاض وتویەتی : ئەگەر تەنها یەك دوعام وەرگیرا بوایە ئەوە بۆ هیچ نەمدەکرد تەنها بۆ سوڵتان نەبێ .
أحمد ی کوڕی کامل فەرموویەتی : له الحسين ی کوڕی محمد الطبري، له عبدالصمد ی کوڕی زید فەرموویەتی : گوێم له فضیل بوو دەیفەرموو : ئەگەر وەڵامی دوعایەکم بدرێتەوە ئەوا دوعام نەدەکرد ئیللا بۆ سوڵتان نەبێت .

پێیان فەرموو : ئەی باوکی عەلی ئەمە ڕوون بکەرەوە، فەرمووی : ئەگەر دوعاکەم بۆ خۆم کرد ئەوە لەخۆم تێناپەڕێ، بەڵام ئەگەر بۆ سوڵتانم کرد ئەوا ئەو چاك دەبێ، بەچاك بوونی ئەو بەندەکان و وڵات چاك دەبێت.

جا فەرمانمان پێکراوە دوعای چاکسازییان بۆ بکەین، فەرمانمان پێ نەکراوە دوعایان لێ بکەین، ئەگەر ستەم و تاوانیان کرد، چونکە ستەم و تاوان لەسەر خۆیانە، چاك بوونیان بۆ خۆیان و موسڵمانانە .

١٣٧ - ولا تذكر أحدا من أمهات المؤمنين إلا بخير .

وە باسی هیچ یەکێك لەدایکانی ئیمانداران مەکە ئیللا بەخێر و چاکە نەبێ .

١٣٨ - وإذا رأيت الرجل يتعاهد الفرائض في جماعة مع السلطان وغيره فاعلم أنه صاحب سنة إن شاء اللّٰه تعالى وإذا رأيت الرجل يتهاون بالفرائض في جماعة وإن كان مع السلطان فاعلم أنه صاحب هوى .

وە ئەگەر کەسێکت بینی بەردەوامە لەسەر فەرزەکان بەجامەعەت لەگەڵ سوڵتان وجگە لەو، بزانە ئەوە خاوەنی سوننەتە ان شاء اللّٰه تعالی، ئەگەر کەسێکت بینی کەم تەرخەمە لەجێبەجێ کردنی فەڕزەکان بەجامەعەت هەرچەندە لەگەڵ سوڵتانیش بێت بزانە ئەوە خاوەنی هەوا و ئارەزووە.

١٣٩ - والحلال ما شهدت عليه وحلفت عليه أنه حلال وكذلك الحرام ما حاك في صدرك فهو شبهة .

وە حەڵاڵ ئەوەیە شایەتی لەسەر بدەیت و سوێندی لەسەر بخۆی حەڵاڵە، هەروەها حەرامیش ئەگەر دڵت پێی توند بوو ئەوە شوبهەیە .

**«مەبەست پێی ئەوەیە کە حەڵاڵ هەیە و گومانی تێدا نییە لە حەڵاڵبوونی، وە حەرامیش هەیە کە گومان نییە لە حەرامبوونی، بەڵام ئەوەی کە گومانی هەیە و هەموو کەس نازانێ، پێویستە لەسەری لێی بکۆڵێتەوە تاکو بزانێت لەکامە بەشە» .**

١٤٠ - والمستور من بان ستره والمهتوك من بان هتكه .

وە کەسی ئابڕوودار ئەو کەسەیە کە داپۆشینەکەی ئاشکرا «**واتە هەڵەکانی داپۆشراوە**»، وە کەسی بێ ئابڕوو ئەو کەسەیە کە ریسوایەکەی ئاشکرایە .

١٤١ - وإذا سمعت الرجل يقول فلان مشبه أو فلان يتكلم بالتشبيه فاعلم أنه جهمي، وإذا سمعت الرجل يقول فلان ناصبي فاعلم أنه رافضي، وإذا سمعت الرجل يقول تكلم بالتوحيد واشرح لي التوحيد فاعلم أنه خارجي معتزلي أو يقول فلان مجبر أو يتكلم بالإجبار أو تكلم بالعدل فاعلم أنه قدري لأن هذه الأسماء محدثة أحدثها أهل الأهواء .

وە ئەگەر گوێت لە پیاوێك بوو دەیوت : فڵانە کەس مشبهە یە، وە فڵانە کەس قسەی دەبارەی تەشبیهـ دەکات، تۆمەتباری بکە و بزانە ئەوە جەهمی یە،وە **«جەهمیەکان پێیان وایە گەر سیفەتێك بۆ الله بسەلمێنیت ئەوا بە درووستکراوت شوبهاندووە. بەڵام ئەهلی سوننە سیفەتەکانی الله دەسەلمێنن بە قورئان و بە سوننە»**، ئەگەر گوێت لە پیاوێك بوو دەیوت : فڵانە کەس ناصبیە، بزانە ئەوە کەسێکی

ڕافیزەیە، وە «**ناصبي** : ئەوانەن ڕقیان لە ئەهلی بەیتە، ئەمەش مەزهەبی ڕافیزەیە ڕق لێبوون لە ئەهلی بەیت»، وە ئەگەر گوێت لێ بووکەسێك دەیوت : دەربارەی یەکخواپەرستی قسەبکە، وە یەکخواپەرستیم بۆ ڕاڤە بکە، بزانە ئەوە کەسێکی خارجی معتزل یە «**لای موعتزلەکان تەوحید بریتیە لە نەفی کردنی سیفاتەکانی الله تعالی پەنا بە الله**»، یان دەیوت : فڵان کەس «**مجبر**» ە یان قسە دەربارەی الإجبار دەکات یا قسەی دەربارەی العدل دەکات بزانە ئەوە کەسێکی قەدەرییە «**العدل بریتیە لە نەفی قەدەر، کە ئەویش یەکێکە لە بنەماکانی موعتەزیلە**»، چونکە ئەم ناوانە داهێنراون ئەهلی بیدعە دایانهێناوە .

١٤٢ - قال عبد اللّٰه بن المبارك لا تأخذوا عن أهل الكوفة في الرفض شيئا ولا عن أهل الشام في السيف شيئا ولا عن أهل

البصرة في القدر شيئا ولا عن أهل خراسان في الإرجاء شيئا ولا عن أهل مكة في الصرف ولا عن أهل المدينة في الغناء لا تأخذوا عنهم في هذه الأشياء شيئا .

عبداللّٰه ی کوڕی المبارك فەرموویەتی : لەئەهلی کوفە دەربارەی الرفض هیچ شتێك وەرمەگرن «**چونکە زۆربەی شیعەکان لە کوفە پەروەردە بوون، کە مەزهەبەکەشیان تانەدانە لە ئەهلی بەیت**»، وە لە ئەهلی شام دەربارەی شمشێر هیچ شتێك وەرمەگرن «**مەبەست لە شمشێر** : **دەرچوونە لە ژێر دەسەڵاتی پێشەوای مسوڵمانان و کوشتنی مسوڵمانان**»، وە لە ئەهلی بەصرەوە دەربارەی قەدەر هیچ شتێك وەرمەگرن «**چونکە ئیعتزال و تەصەوف لە بەصرە پەیدابوو**»، وە لە ئەهلی خۆراسانەوە هیچ شتێك دەربارەی ئیراجاء وەرمەگرن «**چونکە ئیرجاء لە خۆراسانەوە**

پەیدابووە، کە کردەوە ناکەنە بەشێك لە ئیمان، کە **ئەمەش مەزهەبێکی باتڵە**»، وە لەئەهلی مەککەوە دەربارەی الصرف هیچ شتێك وەرمەگرن، لەئەهلی مەدینەوە دەربارەی الغناء گۆرانی هیچ شتێك وەرمەگرن «**چونکە هەندێکیان گۆرانی بەحەڵاڵ دەزانن، بۆیە لەوەدا شتیان لێ وەرناگیرێ**»، لەوانەوە دەربارەی ئەو شتانەی هیچ وەرمەگرن .

١٤٣ - وإذا رأيت الرجل يحب أبا هريرة وأنس بن مالك وأسيد بن حضير فاعلم أنه صاحب سنة إن شاء اللّٰه وإذا رأيت الرجل يحب أيوبا وابن عون ويونس بن عبيد وعبد اللّٰه بن ادريس الأودي والشعبي ومالك بن مغول ويزيد بن زريغ ومعاذ بن معاذ ووهب بن جرير وحماد بن زيد وحماد بن سلمة ومالك بن أنس والأوزاعي وزائدة بن قدامة فاعلم أنه صاحب سنة وإذا رأيت

الرجل يحب أحمد بن حنبل والحجاج بن المنهال وأحمد بن نصر وذكرهم بخير وقال قولهم فاعلم أنه صاحب سنة .

وە ئەگەر کەسێکت بینی «**أبو هريرة و أنس بن مالك و أسيد بن الحضير**» ی خۆشدەوێت بزانە ئەوە لەسەر سوننەتە ان شاء اللّٰه ، ئەگەر کەسێکت بینی «**أيوب و إبن عون و يونس بن عبيد و عبدالله بن إدريس الاودي و الشعبي و مالك بن مغول و يزيد بن زريع و معاذ بن معاذ و روهب بن جرير و حماد بن زيد و حماد بن سلمة و مالك بن أنس و الأوزاعي و زائدة بن قدامة**» ی خۆشدەوێت بزانە ئەوە لەسەر سوننەتە، ئەگەر کەسێکت بینی «**احمد بن حنبل و الحجاج بن المنهال و أحمد بن نصر**» ی خۆش دەوێت و باسیان دەکات بەچاکە و قسەکانی ئەوانی دەگوت بزانە ئەوە لەسەر سوننەتە .

١٤٤ - وإذا رأيت الرجل يجلس مع أهل الأهواء فاحذره واعرفه فإن جلس معه بعدما علم فاتقه فإنه صاحب هوى .

وە ئەگەر کەسێکت بینی لەگەڵ هەوا و ئارەزوو پەرستاندا دادەنیشێ، ئەوە ئاگاداری بکەرەوە، وە پێی بناسێنە، جا ئەگەر لەگەڵیدا دانیشت لەدوای ئەوەی زانی، ئەوا خۆتی لێ بپارێزە، چونکە ئەوە خاوەنی ئارەزووە .

**«مەبەست لە «اهل الهواء» ئەو کەسانەن کە شوێن هەوا و ئارەزووەکانیان دەکەون، ئەوەی کە نەفسیان حەزیان لێیەتی، شوێنی قورئان و سونەت ناکەون، ئەوکاتە قورئان و سونەت وەردەگرن کە لەگڵ ئارەزووەکانیان بگونجێ ئەگینا وەریناگرن» .**

١٤٥ - وإذا سمعت الرجل تأتيه بالأثر فلا يريده ويريد القرآن فلا تشك أنه رجل قد احتوى على الزندقة فقم من عنده ودعه .

وه ئەگەر بیستت کابرایەك فەرموودەی بۆ دەهێنیتەوە کەچی نایەوێت، تەنها قورئانی دەوێت، ئەوا هیچ گومانت نەبێ ئەو کەسە زەندەقەی تێدایە، بۆیە لای ئەو هەستە و وازی لێ بهێنە .
**«مەبەست پێی قورئانیەکانە کە تەنها ئایەت وەردەگرن و فەرموودەکان ڕەتدەکەنەوە لەکاتێك کە الله لەچەندین ئایەت فەرمانی پێکردووین گوێڕایەڵی و شوێنکەوتەی سونەت بین» .**

١٤٦ - واعلم أن الأهواء كلها ردية تدعو إلى السيف وأردؤها وأكفرها الرافضة والمعتزلة والجهمية فإنهم يريدون الناس على التعطيل والزندقة .

وە بزانە هەوا و ئارەزووەكان هەمووی خراپن هەمووی بانگەشەی دەكەن بۆ شمشێر «**هەوا و ئارەزوو خەڵك بەرەو فیتنە دەبات، دەبێتە هۆی تێكچوونی یەكڕیزی مسوڵمانان، وە بە جەنگ كۆتایی هاتووە وەك شەهید بوونی ئیمامی عثمان و علي** رضي الله عنهما »، لە هەموویان خراپتر و كوفرتر الروافض و المعتزلة و الجهمية ن جا ئەوانە خەڵكی دەگێڕنەوە بۆ پەكخستن «**التعطيل** : **نەفی كردنی ناو و سیفاتە بەرزەكانی الله تعالى پەنا بە الله** » و زەندەقە «**الزندقة** : **ڕەتكردنەوەی قورئان و سوننەتە، لەجیاتی ئەوانە شوێن هەوا و ئارەزوو دەكەون**» .

١٤٧ - واعلم أنه من تناول أحدا من أصحاب رسول اللّٰه ﷺ فاعلم أنه إنما أراد محمدا ﷺ وقد آذاه في قبره .

وه بزانه هەرکەسێ قسەی به یەکێك له هاوەڵانی محمد صلى الله عليه وسلم ی وت، ئەوا بزانه ئەو کەسە مەبەستی محمد صلى الله عليه وسلم ، وه ئازاری ئەوی داوه لەگۆڕەکەیدا .

١٤٨ - وإذا ظهر لك من إنسان شيء من البدع فاحذره فإن الذي أخفى عنك أكثر مما أظهر .

وه ئەگەر لەهەر کەسێکەوه شتێکی بیدعەت بۆ دەرکەوت، ئەوه ئاگاداری به چونکه ئەوەی لێت شاردراوەتەوه لەوه زۆرتره که بۆت ئاشکرابووه .

١٤٩ - وإذا رأيت الرجل من أهل السنة رديء الطريق والمذهب فاسقا فاجرا صاحب معاص ظالما وهو من أهل السنة فاصحبه

واجلس معه فإنه ليس تضرك معصيته وإذا رأيت الرجل عابدا مجتهدا متقشفا محترفا بالعبادة صاحب هوى فلا تجلس معه ولا تسمع كلامه ولا تمشي معه في طريق فإني لا آمن أن تستحلي طريقه فتهلك معه .

ئەگەر کەسێکت بینی لە ئەهلی سوننە ڕێگا و مەزهەبی باش نەبوو، فاسق و تاوانکار بوو، خاوەنی سەرپێچی و ستەمکار بوو ئەوە لەسەر سوننەتە، هوڕێیەتی بکە، وە لەگەڵیشی دابنیشە، چونکە سەرپێچی کردنەکەی زیانت پێ ناگەیەنێت، وە ئەگەر کەسێکت بینی لە خواپەرستیدا زۆر هەوڵی دەدا وازی لە دونیا هێناوە و لەناو عیبادەت سوتاو بێت بەڵام خاوەنی هەوا و ئارەزوو بوو، ئەوا لەگەڵیدا دامەنیشە، گوێ بۆ قسەکانی مەگرە، وە لە ڕێگادا لەگەڵیدا ڕێ مەکە، چونکە من دڵنیا نیم ڕێگاکەی حەڵاڵ بکەیت، لەگەڵ ئەودا بەهەلاکەت بچیت .

یونس ی کوڕی عبید کوڕەکەی خۆی بینی لای خاوەنی هەواو ئارەزوویەکەوە دەرچوو، فەرمووی : کوڕم لە کوێوەوە دەرچوویت؟
وتی : لای فلان «**کە عەمری کوڕی عبید ە، شەیخی معتزلەکان**»
فەرمووی : کوڕم ئەگەر بتبینم لە ماڵی خنثی «**نێرەمووك**» دەرچیت، پێم خۆشترە لەوەی لە ماڵی فڵان و فڵانەوە دەرچیت، لەبەر ئەوەی کوڕەکەم ئەگەر بگەیتەوە بە اللّٰه وەك کەسێکی زیناکاری فاسقی دزی خائین، پێم خۆشترە لەوەی پێی بگەیتەوە و لەسەر قسەی فڵان و فڵان «**قسەی هەواو ئارەزووەکان**» بیت .
ئایە نابینی یونس ی کوڕی عبید زانیویەتی کە کەسێکی الخنثی «**نێرەمووك**» کوڕەکەی گومرا ناکات لەدینەکەی، بەڵام خاوەنی بیدعە گومڕایی دەکات تاکو کوفر دەکات .

١٥٠ - واخذر ثم احذر أهل زمانك خاصة، وانظر مَنْ تجالس، وممن تسمع ومَنْ تصحب، فإن الخلقَ كأنهم في رِدَةٍ : إلاَّ مَنْ عصمه اللّٰه منهم .

ئاگاداربە ئینجا ئاگاداری کەسانی زەمانی خۆت بە بەتایبەتی، تەماشا بکە لەگەڵ کێدا دادەنیشی، وە گوێ لە کێ دەگریت و هاوڕێیەتی کێ دەکەیت، چونکە خەڵکی هەر دەڵێی لە هەڵگەڕانەوەدان، ئیللا ئەوانە نەبێ کە اللّٰه تعالی پاراستوونی .

١٥١ - وانظر إذا سمعت الرجل يذكر ابن أبي دؤاد، وبِشْرَ المَرِيْسِيّ، وثُمَامَة، أو أبا الهذيل، أو هشام الفُوطي، أو واحداً من أتباعهم، وأشياعهم : فاحذره فإنه صاحب بدعة، فإن هؤلاء كانوا عاى الردّة، واترك هذا الرجل الذي ذكرهم بخير، ومَنْ ذَكَرَ منهم.

وە سەیرکە ئەگەر کەسێکت بینی بە باشە باسی ابن ابو دؤاد و بشر المريسي و ثمامة، یان ابو هذيل، یان هشام الفوطي، یان هەر یەکێك لەشوێنکەوتووان و جەماعەتی ئەوانی کرد، ئەوا ئاگاداری بە چونکە ئەوە خاوەنی بیدعەیە، چونکە ئەوانە لەسەر هەڵگەڕانەوە بوون، واز لەو پیاوە بهێنە بەباشە باسیان دەکات یان باسی یەکیك لەوان دەکات .

«ابن ابو داؤد و بشر المريسي : ئەو دووکەسە بوون کە پێشنیریان بۆ مەئمون کرد تا ئیمامی أحمد رحمه الله سزا بدات، تەنیا لەبەرئەوەی بڵێن قورئان درووستکراوە.

ثمامة ـ کڕی الأشرس : یەکێکە لە سەرکردەی گومڕاکان .

ابو هذيل : یەکێکە لە گەورەکانی موعتەزیلەکان .

هشام الفوطي : یەکێکە لە بیدعەچییەکان» .

١٥٢ - والمحنة في الإسلام بدعة. وأم اليوم فيُمتَحنُ بالسنة : لقوله : إن هذا العلم دين، فانظروا عمّن تأخذون دينكم، ولا تقبلوا الحديث إلاَّ ممن تقبلون شهادته، فنتظر فإن كان صاحب سنة، له معرفة، صدوق، كتبت عنه، وإلاَّ تركته .

وە تاقیکردنەوەی خەڵکی لەئیسلامدا بیدعەیە . بەڵام ئەمڕۆ بەسوننەت تاقیدەکرێتەوە، لەبەرئەو وتەیەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : بزانن ئەم عیلمە دینە، کەواتە سەیرکەن بزانن دینەکەتان لە چ کەسێکەوە وەردەگرن . وە فەرموویەتی : فەرموودە لەهیچ کەسێکەوە وەرمەگرن ئیللا لەو کەسانەوە نەبێ شایەتییەکەی وەردەگرن.

بۆیە سەیر دەکەیت ئەگەر هاتوو کەسەکە خاوەنی سوننەت بوو، شارەزا و ڕاستگۆ بوو، ئەوا فەرموودەی لێوە دەنووسین ئەگەرنا وازی لێ دەهێنرێ .

١٥٣ - وإذا أردت الاستقامة على الحق وطريق أهل السنة قبلك: فاحذر الكلام، وأصحاب الكلام والجدال والمراء والقياس والمناظرة في الدين، فإن استماعك منهم وإن لم تقبل منهم : يقدح الشَّكَ في القلب، وكفى به قبولا : فتهلك، وما كانت زندقة قط ، ولا بدعة ، ولا هوى، ولا ضلالة، إلاَّ من الكلام والجدال والمراء والقياس وهي أبواب البدعة والشكوك والزندقة.

ئەگەر دەتەوێت دامەزراو بیت لەسەر حەق و ڕێگای ئەهلی سوننەی پێش خۆت، ئەوا ئاگاداری قسە بە، وە خاوەنی قسە و مشتومڕ و ناکۆکی و مناظرە بە لە دیندا «**مناظرة** : **واتە مناقشە کردن لەسەر بابەتێکی دیاریکراو**»، چونکە گوێ گرتنت لێیان هەرچەندە لێیان وەرنەگری ئەوا گومان و دوو دڵی لەدڵتدا دروست دەکات، بەسیەتی ئەو وەرگرتنە، ئەوا

بەهەلاکەتدا دەچیت، هەرگیز زەندەقە و بیدعە و ئارەزووی، وە گومڕایی پەیدا نەبووە ئیللا لە ڕێگای قسە و مشتومڕ و ناکۆکی و قیاسـەوە نەبێ، ئەویش دەرگاکانی بیدعە و گومان و زەندەقەیە.

**«واتە ئەوەندە ترسناکە گەر وتەکانیشیان قبوڵ نەکەیت کەمترین شت کە کارت تێبکات ئەوەیە کە گومانت بۆ درووست دەکەن . یا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك» .**

١٥٤ - فاللّٰه اللّٰه في نفسك، وعليك بالأثر واصحاب الأثر والتقليد، فإن الدين إنما هو التقليد : يعني : للنبي ﷺ وأصحابه رضزات اللّٰه عليهم أجمعين، ومَنْ قبلنا لم يدعونا في لبس، فقلدهم واسترح ولا تجاوز الأثر وأهل الأثر .

ئاگاداری نەفست بە، وە دەست بگرە بە ئەثەر و ئەهلی ئەثەر وە شوێنیان بکەوە، چونکە دین بریتییە لە شوێنکەوتن «**تقلید لێرە بە مانای شولنکەوتن دێت**» واتە : شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی اللّٰه لێیان ڕازی بێت ، وە ئەوانەی دوای ئەوان، بۆیە شوێنیان بکەوە و ئاسوودەبە «**واتە کاتێ تۆ شوێنیان دەکەویت ئیتر هەست بە ئاسوودەیی دەکەیت چونکە لەسەر حەقن**» وە تێمەپەڕە لە ئەثەر و ئەهلی ئەثەر .

١٥٥ - وقف عند المتاشبه، ولا تقس شيئاً .

وە لە ئاستی لێکچووەکانی قورئان و فەرموودەدا ڕاوەستە و هیچ شتێك قیاس مەکە «**قیاسی پوچەڵ**» .

«چونکە گومڕاکان ئەو ئایەتانەی محکم ـن وازی لێدەهێنن و لێکچووەکان دەکەنە بەڵگە .

محکم: واتە ئەو ئایەتانەی تەئویل هەڵناگرن و ماناکانیان ڕۆشن و دامەزراون .

فەرموودەی لێکچووش هەیە هەروەکو چۆن ئایەتی لێکچوو هەیە» .

١٥٦ - ولا تطلب من عندك حيلة تردّ بها على أهل البدع، فإنك أُمرتَ بالسكوت عنهم، ولا تمكنهم من نفسك، أما علمت أن محمد بن سيرين في فضله لم يُجب رجلاً من أهل البدع في مسألة واحدة، ولا سمع منه آية من كتاب اللّٰه عزّ وجلّ، فقيل له، فقال : أخاف أن يُحَرِّفَهَا فيقع في قلبي شيء .

داوا مەکە لەخۆتەوە ڕێگایەك بدۆزیتەوە بۆ وەڵامدانەوەی ئەهلی بیدعە، تۆ فەرمانت پێکراوە بێدەنگ بیت دەربارەیان، زاڵیان مەکە بەسەر خۆتدا، ئەی نازانی محمدی کوڕی سیرین لەگەڵ ئەو هەمووی فەزڵەیدا وەڵامی پیاوێکی ئەهلی بیدعەی نەدایەوە لەیەك مەسەلەدا، وە گوێبیستی ئایەتێك لە کتێبی اللّٰە عزوجل نەبوو لە ئەوەوە، پێیان گوت، ئەویش فەرمووی : لەوە دەترسم تەحریفی بکات «**واتە لەسەر مانا حەقیقەتەکەی خۆی لابدات**» و لەدڵمدا جێگیر بێت .

١٥٧ - وإذا سمعت الرجل يقول : إنا نحن نعظم اللّٰه إذا سمع آثار رسول اللّٰه ﷺ : فاعلم أنّه جهمي، يريد أن يرد أثر رسول اللّٰه ﷺ ويدفعه بهذه الكلمه، وهو يزعم أنه يُعظم اللّٰه وينزهه، إذا

سمع حديث الرؤية وحديث النزول وغيره. أفليس يردّ أثر رسول الله ﷺ .

وإذا قال : إنّا نعظم اللّٰه أن يزول من موضع إلى موضع، فقد زعم أنه أعلم باللّٰه من غيره : فاحذر هؤلاء، فإن جمهور الناس من السوقة وغيرهم على هذا الحال، وحذر الناس منهم .
وإذا سألك أحد عن مسألة في هذا الكتاب وهو مسترشد : فكلمه وأرشده، وإذا جاءك يناظرك : فاحذره، فإن في المناظرة والمراء والجدال والمغالبة والخصومة والغضب وقد نُهِيتَ عن هذا جداً يخرجان جميعاً من طريق الحق، ولم يبلغنا عن أحد من فقهائنا وعلمائنا أنه ناظر أو جادل أوخاصم. قال الحسن البصري : الحكيم لايُمَارِي ولا يُدَارِي في حكمته أن ينشرها، إن قُبِلَت : حَمِدَ اللّٰه ، وإن ردّت : حَمِدَ اللّٰه .

وجاء رجل إلى الحسن فقال : أنا أناظرك في الدين، فقال الحسن : أنا عرفتُ ديني، فإن ضَلَّ دينك فاذهب فاطلبه .

وسمع رسول اللّٰه ﷺ قوماً على باب حجرته يقول أحدهم : ألم يقل اللّٰه كذا؟ وقال الآخر : ألم يقل اللّٰه كذا ؟ فخرج مغضباً فقال : أبهذا أُمِرْتُم أم بهذا بُعثت إليكم، أن تضربوا كتاب اللّٰه بعضه ببعض .

فنهى عن الجدال .

وكان ابن عمر يكره المناظرة ومالك بن أنس ومَنْ فوقه ومَنْ دُونَهُ إلى يومنا هذا، وقول اللّٰه عزّ وجلّ أكبر من قول الخلق، قال اللّٰه تبارك وتعالى : مَا يُجَادِلُ في آيَاتِ اللّٰه إلاَّ الَّذينَ كَفَرُوا .

وسأل رجل عمر بن الخطاب فقال : ما النشطات نشطاً؟ فقال : لو كنت محلوقاً : لضربت عنقك .

وقال النبي ﷺ : المؤمن لا يماري ولا أشفع للمماري يوم القيامة، فدعوا المراء : لقلة خيره .

ئەگەر گوێت لەکەسێك بوو وتی : ئێمە اللّٰه بە گەورە دەزانین، کاتێ باسی فەرموودەکانی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ ی بۆ بکرێت، ئەوا بزانە ئەو کەسە جەهمییە، دەیەوێ فەرموودەکانی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ ڕەتبکاتەوە بەو وشەیە، لەکاتێکدا ئەو بانگەشەی ئەوە دەکات کە دەیەوێ اللّٰه تعالی بە گەورە بزانێ و بە پاکی ڕابگرێ، کاتێ فەرموودەی بینینی اللّٰه تعالی و فەرموودەی دابەزین و جگە لەوە ببیستێ، ئایە ئەو فەرموودەکانی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ ی ڕەت نەکردووەتەوە!

کاتێ دەڵێ : ئێمە اللّٰه تعالی بە گەورە دەزانین لەجێگایەکەوە دابەزێتەوە جێگایەکی تر، جا ئەو بانگەشەی ئەوەی کردووە ئەو شارەزاترە دەربارەی اللّٰه لە غەیری خۆی، بۆیە ئاگاداری ئەوانە بە، چونکە زۆربەی عەوامی خەڵك و جگە لەوان لەو حاڵەتەن، ئاگاداری خەڵکی بکەرەوە لێیان .

«جەهمییەکان دەیانەوێت بەو وشەیە ئێمە الله بە گەورە دەزانین خەڵك گومڕا بکەن، چونکە کاتێ گوێیان لەو فەرموودانەی دەربارەی بینین و دابەزینی الله تعالی دەبێت، دەڵێن : ئێمە الله بەگەورە دەزانین لەو جۆرە فەرموودانە، پێیان وایە گەر بڵێیت الله سیفەتی بینین و دابەزینی هەیە ئەو لێکچواندنت کردووە لەنێوان الله و درووستکراوەکان، بەڵام پەنا بە الله لەو عەقیدە باطلە هەر سیفەتێك لە قورئان و سوننەت جێگیر کرابێت واجبە تۆش جێگیری بکەیت بێ ئەوەی لە چۆنیەتەکەی بپرسیت» .

ئەگەر کەسێك پرسیاری لێکردی دەربارەی ئەم بابەتە وە کەسەکەش داوای ڕێنمویی دەکات، ئەوا قسەی لەگەڵ بکە و ڕێنموویی بکە، وە ئەگەر هات بۆ لات تاکو مناظرەت «**مناظرة** : **واتە گفتوگۆکردن لەسەر بابەتێکی دیاریکراو بە ئەدەب و ڕێزەوە**» لەگەڵ بکات، ئەوا ئاگاداربە، چونکە لە مناظرەدا دەمەقاڵێ و مناقشە و زاڵبوون و ڕکەبەرایەتی و تورەبوون هەیە، تۆش دەربارەی ئەوانە ڕێگریت لێکراوە، ئەوەش خەڵکی لەسەر ڕێگای حەق لادەبات، وە پێمان نەگەیشتووە لەهیچ فەقیهێك لە فوقەهاکان و زانایێك لە زانایەکان هەرگیز مناظرە یان مناقشە و ڕکەبەرایەتیان کردبێت .

الحسن البصري فەرموویەتی : کەسی دانا جیدالی بێ سوود ناکات و نەرمی نواندن لەگەڵ کەس ناکات «**واتە نەرمی نانوێنێت بەرامبەر ئەهلی ناحەق و تەسلیمیان نابێت**»، ئەو حیکمەتەکەی خۆی بڵاو دەکاتەوە، ئەکەر وەرگیرا ئەوا

سوپاسی اللّٰه دەکات، ئەگەر ڕەتکرایەوە هەر سوپاسی اللّٰه دەکات .

**«ئەوەی لەسەرتە ئیقامە حوججەکە بگەیەنیت ئیتر هیدایەتی دڵەکانیش بەویستی اللە ـیە» .**

پیاوێك هاتە لای الحسن بصري وتی : من مناظرەت لەگەڵدا دەکەم لەدیندا، حەسەن فەرمووی : من دینەکەی خۆمم زانیوە، گەر تۆ دینەکەی خۆت ونکردووە ئەوا بڕۆ بەدوایدا بگەڕێ .

پێغەمبەر ﷺ گوێی لە کۆمەڵێك بوو لە پێش ژوورەکەیدا یەکێکیان دەیوت : ئایە اللّٰه وای نەفەرمووە؟ ئەویتر دەڵێت : ئایە اللّٰه وای نەفەرمووە؟ ئەویش «**واتە پێغەمبەر** ﷺ » بەتوڕەییەوە دەرچووە دەرەوە فەرمووی : ئایە بەمە فەرمانم پێتان کردووە؟ یان بۆ ئەمە ڕەوانەکراوم؟ کیتابەکەی اللّٰه بەیەکتردا بدەن؟! بۆیە نەهی جیدالی لێکردن .

وە إبن عمر رضي الله عنهما حەزی بە مناظرە نەدەکرد، وە مالکی کوڕی ئەنەس رضي الله عنه و ئەوانەی سەرووی ئەو و ئەوانەی خوارەوەی ئەو تاکو ئەمڕۆ، قسەی اللّٰه عزوجل گەورەترە لە قسەی خەڵکی، اللّٰه تبارك وتعالى دەفەرموێت : هیچ کەس جیدال و دەمە دەم ناکات لەبەرامبەری ئایەتەکانی اللّٰه ئیللا بێ باوەڕەکان نەبێت .

پیاوێك پرسیاری کرد لە عومەری کوڕی خطاب رضي الله عنه وتی : الناشطات نشطا چییە؟

فەرمووی : ئەگەر سەرت تاشراو بوایە، ئەوا لەگەردەنتم دەدا «چونکە ئەمە سیفەتی خەواریج بوو لە شتێکیان دەپرسیی کە پێویستیان پێی نییە» .

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : کەسی ئیماندار جیدالی بێ سوود ناکات و شەفاعەتی بۆ ناکەم لەڕۆژی قیامەتدا، بۆیە واز لە مشتومڕ بێنە لەبەر کەمی خێرەکەی .

١٥٨ - ولا يَحِل لرجل مسلم أن يقول: فلان صاحب سنة : حتى يعلمَ منه أنَّه قد اجتمعت فيه خصال السنة، لا يُقَال له : صاحب سنة : حتى تجتمع فيه السنة كلها .

حەڵاڵ نییە بۆ هیچ کەسێکی موسڵمان بڵێت : فڵان کەس خاوەنی سوننەتە، تاکو نەزانێ ئاکارەکانی سوننەتی تێداکۆبووتەوە، پێی ناوترێت خاوەنی سوننە تاکو هەموو سوننەی لا کۆ نەبێتەوە .

**«واتە نابێت بێ ئەوەی هیچ زانیاریەکت دەربارەی هەبێت مەدحی بکەیت، چونکە لەوانەیە**

بەهۆی تۆوە لای خەڵك خۆشەویست بێت و خەڵكیش شوێنی بكەون، ئاكارەكانی سوننەت واتە لە عەقیدە و علم و كار و كردەوە و شوێنكەوتنی سەلەفی صالح بێت» .

١٥٩ - وقال عبد اللّٰه بن المبارك : أصل اثنين وسبعين هوى : أربعة أهواء فمن هذه الأربعة أهواء انشعبت هذه الاثنان وسبعون هوى : القدرية، والمرجئة، والشيعة والخوارج . فمن قدّم أبا بكر وعمر وعثمان وعليًا على جميع أصحاب رسول اللّٰه ﷺ ، ولم يتكلّم في الباقين إلاَّ بخير، ودعا لهم : فقد خرج من التشيع أوله وآخر، ومن قال : الإيمان قول وعمل، يزيد وينقص : فقد خرج من الإرجاء كله أوله وآخره، ومن قال : الصلاة خلف كل بر وفاجر، والجهاد مع كل خليفة، ولم ير الخروج على السلطان بالسيف، ودعا لهم بالصلاح : فقد خرج من قول الخوارج

أوله وآخره، ومَنْ قال : المقادير كلها من اللّٰه عزّ وجلّ، خير وشرها، يضل منْ يشاء : ويهدي مَنْ يشاء : فقد خرج من قول القدرية أوله وآخره، وهو صَاحِبُ سُنَّةٍ .

وه عبداللّٰه ی کوڕی المبارك دەفەرموێت : بنەمای حەفتاو دوو ئارەزووکە چوار ئارەزووە، جا لەم چوار ئارەزووەوە حەفتاو دوو ئارەزووەکەی لێ بووەتەوە : «**القدرية والمرجئة والشيعة والخوارج**» .

جا هەر کەسێک ئەبو بەکرو عومەر و عثمان و علي اللّٰه لێیان ڕازی بێت پێشخست بەسەر هەموو هاوەڵانی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ و قسەی بە ئەوانیتر نەگوت ئیللا بەچاکە نەبێ و دوعای بۆکردن، ئەوا لە «**التشيع**» دەردەچێت لەسەرەتاو کۆتاییەکەی .

«چونکە شیعە دەڵێن : علي رضي الله عنه خەلیفەیە لەدوای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وە سێ خیلافەتەکە پوچەڵە و ابو بکر و عمر الله لێیان ڕازی بێت بە کافر دەزانن، بێجگە لەوەش قسە و جنێو بەهاوەڵان دەدەن و زەمیان دەکەن» .

هەرکەسێ بڵێ : ئیمان وتە و کردەوەیە زیاد دەکات و کەم دەکات دەکات، ئەوا لەئیرجاء دەچێتە دەرەوە سەرەتاو کۆتاییەکەی .

«چونکە مورجیئە پێیان وایە ئیمان یەك بەشە یان ئەوەتا ئیمانت هەیە یانیش هەر نیتە، وە پێیان وایە گەر تۆ هیچ کردەوەیەك نەکەیت تەنیا بە زمان دەریببڕی ئەوا تۆ ئیمانداری ئەمەش پێچەوانەی عەقیدەی ئەلی سوننە و جماعەیە» .

هەرکەسێ بڵێ : نوێژکردن لە پشت هەموو چاك و خراپێکەوە دروستە و جیهاد لەگەڵ هەموو خەلیفەکداو «**خەلیفەی مسوڵمان ئەوەی کە هیچ شرك و کوفرێکی نییە**» دەرچوون نابینێ لەدژی سوڵتان بەشمشێر و دوعای چاکسازییان بۆ بکات ئەوا لە قسەی خەواریج دێتە دەرەوە سەرەتا و کۆتاییەکەی.

«**چونکە خەواریج دەرچوون لەژێر فەرمانی وەلی ئەمری مسوڵمان و نوێژیان لەدواوە نەدەکرد و دژیان دەوەستانەوە و جیهادیان لەگەڵ نەدەکردن و گوێڕایەڵیان نەدەکرد بەتاوان خەڵکیان کافر دەکرد کە ئەمەش پێچەوانەی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جماعەیە**» .

هەرکەسێ بڵێ : تەقدیرەکان هەموو لە اللّٰه وەیە، بە چاکە و خراپە، هەرکەسێ ویستی لێ بێت ئەوا گومڕایی دەکات و هەرکەسێ

ویستی لێ بێت ئەوا هیدایەتی دەدا ئەوا لەقسەی «**قەدەر**» یەکان دەردەچێت سەرەتاو کۆتاییەکەی . ئەویش خاوەنی سوننەیە.

**«قەدەریەکان دەڵێن : هەرشتێك کە ڕوودەدات لە چاك و خراپ و گومڕایی و هیدایەت و سوود و زیان هتد ئەوا بەندە خۆی ویستی لێیەتی و دوورە لە ویستی الله و پێشتر الله علمی بەوە نەبووە کە ڕوودەدات والعیاذ بالله کە ئەمەش پێچەوانەی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جماعەیە» .**

١٦٠- وبدعة ظهرت هي كفرٌ باللّٰه العظيم، ومن قال بها : فهو كافرٌ باللّٰه لا شك فيه، من يؤمن بِالرَّجْعَةِ، ويقول : عليّ ابن أبي طالب حيٌّ وسيرجع قبل يوم القيامة، ومحمد بن علي، وجعفر بن محمد، وموسى بن جعفر، وتكلموا فيه، وأنهم يعلمون

الغيبَ، فاحذرهم، فإنهم كفارٌ باللّٰه العظيم، ومن قال بهذا القول .

وە بیدعەیەك پەیدا بووە ئەویش کوفرە بە اللّٰه تعالی، وە هەرکەسێکیش وابڵێ ئەوا کافرە و هیچ گومانی تێدا نییە، هەر کەسێ باوەڕی بە گەڕانەوە هەبێت، وەدەڵێن : علي کوڕی أبي طالب رضي الله عنه زیندووە، وە دەگەڕێتەوە پێش ڕۆژی قیامەت، وە محمد ی کوڕی علي و جعفر ی کوڕی محمد و موسی ی کوڕی جعفر «**واتە پێیان وایە ئەمانە دەگەڕێنەوە پێش ڕۆژی قیامەت**»، لەسەر ئەو قسەیان، وە باوەڕیان وایە کە علمی غەیب دەزانن، «**واتە لەبەر ئەو قسەیە کە هەرکەسێك بڵێت ئەم ئیمامانە دەگەڕێنەوە پێش ڕۆژی قیامەت و نەمردوون ئەوا کافر دەبێت و هیچ گومانی تێدا نییە، وە ئەوانەشی بڵێن کە علمی غەیب ئەزانن**

**ئەوان»**، ئاگاداریان بە، بەڕاستی ئەمانە کافرن بە اللّٰە تعالی، وە ئەوەیشی ئەو قسەیە دەکات .

**«ئەمە فکرەی رافضەیە و پێیان وایە ئەم ئیمامانە معصومن، ئەوانە خەلیفەن لەدوای پێغەمبەر ﷺ »**.

١٦١ - قال طعمه بن عمر وسفيان بن عيينة : من وقف عند عثمان وعلي : فهو شيعي، لا يُعدّل، ولا يكلَّم ولا يجالس ومَنْ قدّم علياً على عثمان : فهو رافضي قد رفضَ أثر أصحاب رسول اللّٰه ﷺ ، ومَنْ قدّم الثلاثة على جماعتهم، وترحم على الباقين، وكفّ عن زللهم : فهو على طريق الإستقامة والهدى في هذا الباب .

وە طعمە ی کوڕی عمرو، و سفیان ی کوڕی عیینە رەحمەتی اللّٰە یيان لێ بێ دەفەرموون : هەرکەسێ لەئاستی عثمان و عەلیدا وەستا «واتە علي پێش عثمان بخات لە خەلیفە کە ئەمەش ڕافیضەن»، ئەوا شیعەیە، نابێ تەعدیل بکرێت «**واتە حوکم نادرێت بە عەدالەت بوونی**»، وە نابێ قسەی لەگەڵدا بکرێ، وە نابێ لەگەڵیدا دانیشی، وە هەرکەسێ علي پێش عثمان خست ئەوا رافضەیە، چونکە فەرموودەکانی هاوەڵانی پێغەمبەری اللّٰە ﷺ ی رەتکردووتەوە، هەرکەسێ ئەو چوارەی پێش هەموویان خست «**واتە چوار پێشەواکە : ابو بکر الصدیق، عمر بن الخطاب، عثمان بن العفان، علي بن ابي طالب** رضي الله عنهم **اجمعين**»، وە ڕەحمەتی بۆ ئەوانیتر نارد، وە وازی لەباسکردنی هەڵەکانیان هێنا، ئەوا لەسەر ڕێگای سەقامگیرییە و هیدایەتە لەم باسەدا .

١٦٢ - والسنّة أن تشهد أنَّ العشرة الذين شعد لهم رسول اللّٰه ﷺ بالجنة، أنهم في الجنة لا شك فيه .

وه لەسوننەتدایه شایەتی بدەیت ئەو دە کەسەی کە پێغەمبەری اللّٰه ﷺ شایەتی بەهەشتی بۆ داون، ئەوان لە ئەهلی بەهەشتن بەبێ هیچ گومانێك .

**«دە مژدە پێدراوەکە : ابوبكر و عمر و عثمان و علي و طلحة بن عبيد الله و الزبير بن العوام و سعد بن ابي وقاص و سعيد بن زيد بن عمرو بن نفيل و عبدالرحمن بن عوف و أبو عبيدة الجراح» .**

١٦٣- ولا تُفْرِد بالصلاة على أحد إلاَّ لرسول اللّٰه ﷺ وعلى آله فقط .

وە هیچ كەسێك تایبەتمەند مەكە بە صەڵاوات دان تەنها پێغەمبەری اللّٰه ﷺ و ئالی پێغەمبەر نەبێت ﷺ . **«تەنیا بۆ بۆ ناوی محمد ﷺ بەتەنیا دێنیت نەك نزیكەكانی پێغەمبەریش ﷺ بەتەنیا بێنیت، ئەمە كاری شیعەیە كاتێ دەڵێن علي لەگەڵیدا دەڵێن عليه السلام یان فاطمة عليها السلام»** .

١٦٤ - وتعلم أنَّ عثمانَ بن عفان قُتِلَ مظلوماً، ومن قتله كان ظالماً .

وە بزانە عثمانی كوڕی عەففان رضي الله عنه بە ستەملێكراوی كوژرا و ئەوەی كوشتی ستەمكارە .

١٦٥ - فمن أقرَّ بما في هذا الكتاب وآمن به واتخذه إماماً، ولم يشك في حرف منه، ولم يجحد حرفاً واحداً : فهو صاحب سنة وجماعة كامل قد كملت فيه السنة، ومن جحد حرفاً مما في هذا الكتاب، أو شك في حرف منه، أو شك، أو وقف : فهو صاحب هروى .

وە هەرکەسێ دان بەوەدا بنێت لەم کتێبەدا هەیە و بڕوای پێی هێنابێت و بیکاتە پێشەنگی خۆی و لەیەك پیتدا گومانی نەبێ، وە نکۆڵی لەیەك پیتی نەکات، ئەوا خاوەنی سوننە و جەماعەیە، بەتەواوی جەماعەتی تێدا کامل بووە، هەرکەسێ نکۆڵی لە پیتێك بکات لەوەی لەم کتێبەدا هەیە، یان گومانی لەپیتێکی هەبێت، یان گومانی بوو وەستا، ئەوا خاوەنی هەوا و ئارەزووە .

**«مەبەستی ئەم کتێبەیە شرح السنة»** .

١٦٦ - ومَنْ جَحَدَ أوشك في حرف من القران، أو في شيء جاء عن رسول اللّٰه ﷺ ، لقي اللّٰه تعالى مكذباً : فائق اللّٰه واحذر وتعاهد إيمانك .

وە هەرکەسێك نکۆڵی یان گومانی هەبێت لەپیتێك لە قورئان، یان لەشتێك لەپێغەمبەری اللّٰه وە ﷺ هاتبێ، ئەوا دەگاتە اللّٰه تعالی وەکو کەسێکی بەدرۆزنخەرەوە، بۆیە لە اللّٰه بترسە و وریابە دەست بەئیمانەکەتەوە بگرە .

١٦٧ - ومن السنة أن لا تعين أحداً على معصية اللّٰه ، ولا أولي الخير، ولا الخلق أجمعين، ولا طاعة لبشر في معصية اللّٰه ، ولا يحب عليه أحداً، واكره ذلك كله تبارك اللّٰه وتعالى .

وه له سوونتدایه نابێ گوێڕایەڵی هیچ کەسێك بکەی لەسەرپێچی اللّٰه دا، نه دایك و نەباوك، وه نەهەموو خەڵکی، گوێڕایەڵی هیچ مروڤێك نابێ بکرێت لەسەرپێچی اللّٰه دا، لەسەر ئەوە هیچ کەسێکی خۆش نەوێ **«واته هیچ کەسێکت خۆشنەوێت لەسەرپێچیدا»** وڕقت لەهەموو ئەوانە بێ لەبەر اللّٰه تعالی **«واته ڕقت له گوێڕایەڵی سەرپێچی بێت»** .

١٦٨ - والإيمان بأنَّ التوبة فريضة على العباد، أن يتوبوا إلى اللّٰه عزّ وجلّ من كبير المعاصي وصغيرها .

وه باوەڕ بەوەی تەوبە فەڕزە لەسەر بەندەکان، دەبێ تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای اللّٰه عزوجل، لەتاوانە گەورەکان وبچووکەکان .

١٦٩ - ومن لم يشهد لمن شهد له رسول اللّٰه ﷺ بالجنة، فهو صاحب بدعة وضلالة، شاك فيما قال رسول اللّٰه ﷺ .

وە هەرکەسێك شایەتی نەدات بەو کەسەی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ شایەتی بەهەشتی بۆ دابێ، ئەوا کەسێکی خاوەن بیدعە و گومڕاییە، گومانی هەیە لەوەی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ فەرموویەتی.

١٧٠ - قال : مالك بن أنس : من لزم السنة وسَلِمَ منه أصحاب رسول اللّٰه ﷺ ثم مات : كان مع النبيين والصديقين والشهداء والصالحين، وإن كان له تقصير في العمل .

وقال بشر بن الحارث : الإسلام هو السنة، والسنة هي الإسلام .

وقال فضيل بن عياض : إذا رأيت رجلاً من أهل السنة فكأنما أرى رجلاً من أصحاب رسول اللّٰه ﷺ ، وإذا رأيت رجلاً من أهل البدع فكأنما أرى رجلاً من المنافقين .

وقال يونس بن عبيد : العجب ممن يدعو اليوم إلى السنة وأعجب منه من يجيب إلى السنة فيقبل .

وكان ابن عون يقول عند الموت : السنة، السنة، وإيّاكم والبدع حتى مات .

وقال أحمد بن حنبل : مات رجل من أصحابي، فرئي فى المنام فقال : لأبي عبداللّٰه : عليك بالسنة، فإن أول ما سألني اللّٰه سألني عن السنة . وقال أبو العالية : من مات على السُّنَّةِ مَسْتُوراً : فهو صديق، ويقال : الاعتصام بالسنَّةِ نَجَاة .

وقال سفيان الثوري : من أصغى بإذنه إلى صاحب بدعة : خرج من عصمة اللّٰه ، ووكل إليها يعني : إلى البدع .

وقال داود بن أبي هند : أوحى اللّٰه تبارك وتعالى إلى موسى بن عمران : لا تجالس أهل البدع : فإن جالستهم فحاك فى صدرك شيء مما يقولون أكببتك في نار جهنم .

وقال الفضيل بن عياض : من جالس صاحب بدعة لم يعط الحكمة .

وقال الفضيل بن عياض : لا تجلس مع صاحب بدعة، فإني أخاف أن تنزل عليك اللعنة .

وقال الفضيل بن عياض : من أحب صاحب بدعة : أحبط اللّٰه عمله وأخرج نور الإسلام من قلبه .

وقال الفضيل بن عياض : من جلس مع صاحب بدعة في طريق، فَجُزْ في طريق غيره .

وقال الفضيل بن عياض : مَنْ عَظَّمَ صاحب بدعة : فقد أَعَانَ على هدم الإسلام، ومَنْ تَبَسَّمَ في وجهِ مبتدع : فقد استَخَفَّ بما أنزل اللّٰه عزّ وجلّ على محمد ﷺ ومن زَوَّج كريمته

من مبتدع : فقد قطع رحمها، ومن تبع جنازة مبتدع لم يزل في سخط اللّٰه حتى يرجع .

وقال الفضيل بن عياض : آكل مع يهودي ونصراني ولا آكل مع مبتدع، وأحب أن يكون بيني وبين صاحب بدعة حصن من حديد .

وقال الفضيل بن عياض : إذا علم اللّٰه من الرجل أنه مبغض لصاحب بدعة : غفر له، وإن قلَّ علمه، ولا يكن صاحب سنة يمُالىء صاحبَ بدعة إلاَّ نِفَاقاً، ومن أعرض بوجهه عن صاحب بدعة : ملأ اللّٰه قلبه إيماناً، ومن انتهر صاحب بدعة آمنه اللّٰه يوم الفزع الأكبر، ومن أهان صاحب بدعة : رفعه اللّٰه في الجنة مائه درجة، فلا تكن صاحب بدعة في اللّٰه أبداً .

مالیکی کوڕی ئەنەس رحمه الله فەرموویەتی : هەرکەسێك دەست بگرێت بە سوننەتەوە و هاوەڵانی پێغەمبەری ﷺ لێ سەلامەت

بێ و ئینجا بمرێت ئەوا لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکاندایە، هەرچەندە کەمتەرخەمی هەبێت لە کردەوەکانیدا .

«ئەمە فەزڵی ئەو کەسە دەردەخات کە عقیدەیەکی ئەهلی سوننە و جماعەی هەیە و دەستی گرتووە بە سوننەت بەڵام ئەمە وامان لێ نەکات کە ساردمان بکاتەوە و تەمبەڵی ڕوومان تێ بکات بەڵکو ئەبێت بەردەوام لە نێوان ڕەجا و ترس و خۆشەویستی الله وە عیبادەتەکان بکەین و دوعا بکەین بۆ هیدایەت و ثبات» .

وە بشر ی کوڕی الحارث رحمه الله فەرموویەتی : ئیسلام بریتییە لە سوننەت، وە سوننەتیش بریتییە لە ئیسلام .

«واتە ئیسلام ئەو ڕێگایەیە کە پێغەمبەران عليهم السلام هێناویانە وە لە ئیسلامدا ئەوەیە کار

**بەسوننەت بکەیت، وە هەموو پێغەمبەرێکیش ئیسلامی هێناوە» .**

وە فضیل ی کوڕی عیاض رحمه الله فەرموویەتی : ئەگەر کەسێك ببینم لە ئەهلی سوننە وەکو ئەوەیە کەسێك ببینم لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ، وە ئەگەر کەسێك ببینم لە ئەهلی بیدعە وەکو ئەوە وایە کەسێك ببینم لە دووڕووەکان .

وە یونس ی کوڕی عُبید رحمه الله فەرموویەتی : سەیرە کەسێك ئەمڕۆ بانگەوازی دەکات بۆ سوننەت وە لەوە سەیرت ئەوەیە کەسێك وەڵامی سوننەت دەداتەوە و قبوڵی دەکات «**بەهۆی زۆری بیدعە و فیتنە، وە کەمی ئەهلی سوننە و جماعە، الله المستعان**»

وە إبن عون رحمه الله لە کاتی مردن دەیفەرموو : دەست بگرن بەسوننەت، دەست بگرن بە سوننەت، وە دووربکەونەوە لە بیدعە تاکو مرد .

وە ئیمامی أحمد بن حنبل رحمه الله فەرموویەتی : یەکێك لە هاوەڵانم مرد، لە خەودا ئەویان بینیبوو وتی : بە باوکی عبداللّٰه بڵێن : دەست بە سوننەتەوە بگرێت، چونکە یەکەم شت کە اللّٰه تعالى پرسیاری لێکردم دەربارەی سوننەت بوو .

وە أبو العالية رحمه الله فەرموویەتی : هەرکەسێك لەسەر سوننەت بمرێت و هیچ جیاوازیەکی لێ نەبینرێ، ئەوا کەسێکی ڕاستگۆیە .

وە دەفەرموێت : دەست گرتن بەسوننەت ڕزگاربوونە «**واتە ڕزگار بوونە لە ئاگر و سەلامەتە لەهەموو بیدعەیەك**» .

وە سفیان ی الثوري رحمه الله فەرموویەتی : هەرکەسێك بە گوێیەکانی گوێ بۆ خاوەنی بیدعە بگرێت، ئەوا لە پارێزراوی اللّٰه تعالی دەردەچێت و دەسپێردرێ واتە بۆ بیدعەکە «**مانای وایە لە پارێزراوی الله تعالی دەردەچێت و دەسپێردرێ بە بیدعەچیەکە چونکە خۆی گوێی بۆ بیدعەچی سووك کردووە و گوێی بۆ ڕادەگرێت**» .

وە داود ی کوڕی هند رحمه الله فەرموویەتی : اللّٰه تبارك وتعالی وەحی کرد بۆ موسی کوڕی عیمڕان عليه السلام : لەگەڵ بیدعەکاران دامەنیشە، ئەگەر لەگەڵیاندا دانیشتی و شتێك بەدڵتدا هات لەوەی دەیڵێن ئەوا دەچیتە ناو ئاگرەوە .

وە فضیل ی کوڕی عیاض رحمه الله فەرموویەتی : هەرکەسێ لەگەڵ خاوەن بیدعەیەکدا دابنیشی ئەوا چیتر حیکمەتی پێ نابەخشرێ.

وە فضیل ی کوڕی عیاض رحمه الله فەرموویەتی : لەگەڵ خاوەن بیدعەدا دامەنیشە، چونکە لەوە دەترسم لەعنەتت بەسەردا دابارێ .

وە فضیل ی کوڕی عیاض رحمه الله فەرموویەتی : هەرکەسێ خاوەنی بیدعەی خۆش بوێت، ئەوا اللّٰه تعالی کارەکەی پووچەڵ دەکاتەوە و روناکی ئیسلام لەدڵی دەردەکات .

وە فضیل ی کوڕی عیاض رحمه الله فەرموویەتی : لەگەڵ خاوەنی بیدعەدا لەڕێگادا دانیشێت ئەوا لەڕێگایەکی ترەوە بڕۆ «**واتە گەر لەڕێگا ئەوت بینی ئەوا لەگەڵیدا مەڕۆ لەڕێگایەکی ترەوە بڕۆ . وە هاوڕێیەتیان مەکە چونکە کارت تێدەکەن**» .

وە فضیل ی کوڕی عیاض رحمه الله فەرموویەت : هەرکەسێ خاوەن بیدعەچییەك بە مەزن بزانێت ئەوا یارمەتی دەدات بۆ ڕووخانی ئیسلام، هەرکەسێ بە ڕووی مبتدع ێکدا پێبکەنێ ئەوا بە سووك تەماشای ئەوەی کردووە دابەزیوەتە سەر محمد صلى الله عليه وسلم دا هەرکەسێ کچەکەی خۆی دا بە متبدع ێك ئەوا پەیوەندی خزمایەتییەکەی بچڕاندووە، هەرکەسێ شوێن جەنازەی مبتدع ێك بکەوێ ئەوا بەردەوام لەتووڕەبوونی خودایە تاکو دەگەڕێتەوە .

وە فضیل ی کوڕی عیاض رحمه الله فەرموویەتی : لەگەڵ جولەکەو گاوردا نان دەخۆم بەڵام لەگەڵ مبتدع دا ناخۆم، پێم خۆشە لە نێوان من خاوەن بیدعە قەڵایەکی ئاسن هەبێت .

وە فضیل ی کوڕی عیاض رحمه الله فەرموویەتی : ئەگەر اللّٰه تعالى زانی کەسێك ڕقی لە خاوەن بیدعەیە ئەوا لێی خۆش دەبێ،

هەرچەندە کردەوەکانی کەم بێ، کەسێکی خاوەن سوننەت لایەنگیری خاوەن بیدعە ناکات ئیللا دووڕوویی یە، هەرکەسێ ڕووی لەخاون بیدعە وەرگێڕێ ئەوا اللّٰە تعالی دڵی پڕ دەکات لەئیمان، هەرکەسێ تووڕەبێت لە خاوەن بیدع ئەوا اللّٰە تعالی لەڕۆژی قیامەت دڵنیاو بێ ترسی دەکات، هەرکەسێ خاوەن بیدعەیەك ریسوابکات ئەوا اللّٰە تعالی لەبەهەشتدا سەد پلە بەرزی دەکاتەوە، بۆیە لەبەر اللّٰە هەرگیز خاوەنی بیدعە مەبە .

